# کوردو

# مافی چارەی خۆنووسین

نووسینی

سەیران تەها ئەحمەد

پێداچوونەوەی

کاروان جەلال

# توێژینەوە لەسەر
# مەسەلەی کوردو مافی چارەی خۆنووسین

ئامادە کردنی:
ئەندازیاری یاسایی
سەیران تەها ئەحمەد

پێشکەشە بە:

بەهەموو دڵۆپە خوێنێک لە پێناوی ئەم وڵاتەدا ڕژابێت..

بەشەهیدان...

بەگەلەکەم...

بە هەموو ئەوانەی بڕوایان بە مافی چارەی خۆنوسین هەیە...

# پێشەکی..

مافی چارەی خۆنوسین لە سەردەمی ئێستاماندا لە مافە یاساییەکان دادەنرێت. ئەگەر بێینە سەر لێکۆڵینەوە لە (بەها یاساییەکە-القیمە القانونیە) بەو شێویەی کە ئێستا هەیە، بەکتو پڕی وەیان لە بۆشایەوە نەهاتۆتە ئاراوە، بەڵکو لە ئەنجامی هزری شارەزایان و روناکبیران و بە پراکتیک کردنە نێو دەوڵەتیەکانەوە بووە.

بەڵێنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان (بەهای یاسایی)داوە بە پرەنسیپی مافی چارەی خۆنوسین، ئەویش لە رێگەی مادەکانی (٥٥)-وەمادەی (١).

رەگی پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین دەگەرێتەوە بۆ هەردوو شۆڕشی ئەمریکی و فەرەنسی.

جاردانی سەربەخۆیی ئەمریکا لە ١٧٧٦/٧/٤ بەیەکەم هەوڵ دادەنرێت بۆ دیاری کردنی چەمکی چارەی خۆنوسین، پاشان (جاڕدانی مافەکانی مرۆڤ و هاووڵاتی فەرەنسی)لە ١٧٨٩/٨/٢٦دا راگەیەنرا.

کاریگەری ئەم دوو شۆڕشە زۆر بە ئاشکرا رەنگی دایەوە لە پراکتیک کردنی (فعلی) مافی چارەی خۆنوسین دا لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی‌دا.

مافی چارەی خۆنوسین، وەك پرەنسیپێکی یاسای گشتی نێو دەوڵەتی، ناتوانرێت دەست بەرداری بین بۆ هێنانەدی دادوەری و پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی‌نێو دەوڵەتی.

ئەمە لەکاتێکدا بەڵێنامەی (میثاق) نەتەوە یەکگرتووەکان دان دەنێن بە مافی چارەی خۆنوسین دا، وەك پرەنسیپێکی لێك جیا نەبووەوەو پەیوەست بوو بە مافە یەکسانەکانی نێوان نەتەوەکان. لەلایەکی‌ترەو، مافی چارەی خۆنوسین بە مافێك لە مافە مرۆیی‌یەکان دادەنرێت.

کەمافی رەوای هەموو میللەتێکە لە دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسینی خۆیدا.

بەڵام ئایا ئەم مافە چەند بە کورد رەوا دەبینرێت؟

یەکێك لە داواکارییەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد لە (کۆن و نوێ)دا داوای مافی گەلی کورد لە دیاری کردنی چارەنوسی‌دا بووە. وەئەم داواکارییە (شێوەی دیاردەی مادی) چەکداری وەرگرتووە کە داگیرکەران و کۆنە پەرستانی ناوچەکە بە درندەترین شێوازی داپلۆسین روو بەرووی دەبنەوە کەواتە لێرەدا روو بەرووی دوو هەڵوێستی دژ بە یەك دەبینەوە.

١.هەڵوێستی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە بەکارهێنانی هێزی چەکداری بۆ سەپاندنی مافە رەواکانی.

٢.هەڵوێستی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان لەبەکارهێنانی داپلۆسینی سەربازی بۆ لەناوبردنی گەلی کورد. ئایا ئەم دوو هەڵوێستە کامیان یاساییە، وەکامیان رەواترە لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی‌دا.

(رەوایی-مشروعیە)ی پەنا بردنی گەلی کورد بۆ چەك لە شۆڕشەکانیدا لەپێناو هێنانە دی مافێکی زەوت لێ کراوە. (ئەویش مافی چارەی خۆنوسین)ە.

کێشەی کورد یەکێکە لە کێشە سەرەکی‌یەکانی ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەراست، لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا کێشەکە زۆر بە ئاشکراو قوڵتر، هاتە ناو مەیدانی کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیەوە، بە تایبەتی دوای سەرلەنوێ دارشتنەوەی

نەخشەی ڕۆژهەڵاتی ناوراست، لەلایەن هێزە ئیمپریالیستەکانی ئەو سەردەمەدا، دوای جەنگی جیهانی یەکەم، دەرکەوتنی بەرژەوەندییەکانی ئینگلیزو فەرەنسایی‌و ئیتالیەکان لە ناوچەکەدا، بە تایبەتی بەپێی ویستو دەسەڵاتیان، ئەم جارە کوردستان لە دوو پارچەوە کرا بە چوار پارچە.

دۆزینەوەی (کانی ڕەش-نەوت) یەکێك بوو لە هۆکارە سەرەکیەکانی دابەشکردنی (میراتی دەوڵەتی عوسمانی دۆڕاو لە شەڕدا) کە بێگومان زۆرترین بەشی کوردستانی لەژێر دەستا بوو بەر تاڵانی‌و پەرت کردنی زلهێزەکان کەوت.

کێشەی کورد سەخت ترو قوڵتر بوو، بەهۆی سیاسەتی ڕەگەز پەرستانەو جیاکاریيانەی کۆنە پەرستانی ناوچەکەوە، کە لە هەوڵدانی بەردەوامدا بوون بۆ لەبار بردنی کێشە ڕەواکەی‌و لەناوبردنی هەموو بزوتنەوەیەکی کوردی، بە یارمەتی ئیمپریالیزمی جیهانی کە لەو کاتەدا پشتیوانیەکی توندیان لێ دەکرا.

چونکە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست بایەخێکی ستراتیجی لە بەرنامەی وڵاتە زلهێزەکان دا هەیە. وەکوردستانیش ناوجەرگەی ڕۆژهەڵاتی ناوەراستە.

لەبەر ئەم هۆکارانە سەیر دەکرێت بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد، پشتیوانی (مادی‌و مەعنەوی) لێ نەدەکرا. وەهەر جۆرە یارمەتیەکیش بە کورد درابێت، هەر وڵاتە داگیر کەرەکانی کوردستان لە پارچەیەکدا پێشکەش کوردەکانی پارچەیەکی تریان کردووە، ئەم یارمەتی‌دانە هەرگیز بۆ مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەی کوردو بڕوا هێنان بە ڕەوایی مەسەلەکەی نەبووە، وەیان ویستبێتیان کورد بگات بە ئامانجەکانی، بەڵکو جۆرو بڕی یارمەتیەکان بەپێی مەرج‌و پێداویستیە قۆناغیەکانی خۆیان بووە.

چونکە وەك دەزانین وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان (عێراق-تورکیا-ئێران-سوریا)ناکۆکی مێژوویی‌و سنوری‌و هەرێمایيەتیان لەگەڵ یەکتری‌دا هەیە

بەکارهێنانی کارتی کورد بۆ فشار خستنە سەر یەکتریو کورد ئەو دەست کێشە ناوریشمیەیە، بۆ دەست خستنە ناو کاروباری یەکترییەوە.

وە هەر کاتێك (داگیر کەران) گەیشتنە رێك کەوتنێك یان ئەو مەرامەی کە مەبەستیان بووە، زۆر بە ئاسانی پشتیان لە کورد دەکردو ئەمە جگە لەوەی هەمیشە مەرجی سەرەکی رێکەوتنەکانیان بێگومان لەناوبردنی بزوتنەوەی شۆڕشەکانی کورد بووە لەهەر پارچەیەك لە پارچەکانی کوردستاندا بوو بێت.

مێژوو نمونەی زۆری لەم جۆرە رێکەوتنانەی بەخۆیەوە بینیوە. هەر لەو رێکەوتننامانەی نێوان سوڵتانەکانی عوسمانیو شاهەکانی ئێرانی دەبەستراو پەیمان نامەی "سەعد ئاباد" رێکەوتنامە چوار قۆڵیەکانی نێوان "ئێران-عێراق-تورکیا-سوریا"...هتد. ئەمانە هەموویان راستی قسەکانمان دەسەلمێنن.

کپ کردنی مەسەلەی کورد لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتیدا، وپێشێل کردنی مافەکانی، لەبەر چاوی کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیدا، و بێبەری کردنی کورد لە مافی میللەتێکی (خاوەن مافەوە) بۆ هێنانە خوارەوەو کردنی بە کێشەی کەمینە نەتەوەییەکان، کە دەبێت لە چوار چێوەی حکومەتەکانیاندا چارەسەر بکرێت. وەتائێستا بە بەرچاوی جیهانەوە هەموو شێوازێکی داپڵۆسینو لەناو بردنو سڕینەوەی ناسنامەو ئەنفالو کیمیاباران کردنو کۆڕەو... بەرامبەری دەکرێت، بوونە هۆی دەرخستنیو هێنانە کایەی مەسەلەی کورد بۆ ماوەیەکی کاتی، چونکە وڵاتە زلهێزەکان بەرژەوەندییەکانیان پەیوەست بووە بە داگیرکەرانی ناوچەکەوە، لەبەر ئەم هۆیە بەرژەوەندی داگیر کەرانیان لەلا مەبەست تر بووە لە مەسەلەی گەلی کورد.

ئەمە جگە لە نزمی ئاستی هۆشیاری بزوتنەوی رزگاریخوازی گەلی کورد کە لە ئاست پێویست دانەبووە. بۆ دەرخستنی کێشە رەواکانیان.

کورد نەیتوانیوە ڕێکخراوێکی سیاسی کوردی یەك گرتوو پێك بهێنێت کە لە ئاست داواکارییەکانیان بێت، تەنانەت لەهەر پارچەیەك لە پارچەکانی کوردستانی داگیر کراودا، ڕێکخراوی یەکگرتووی یەك ئامانج بەدی ناکرێت. "ئامانجەکانیان زیاتر مۆرکی حزبایەتی تێدا ڕەنگ دەداتەوە نەك بەرژەوەندی بالاّی میللەتی کورد".

لە کاتێکدا داگیر کەرانی کوردستان خەریکی لەناو بردنو قەلاّچۆکردنی کوردن. بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردیش زۆربەی هێزو تواناکانی تەرخان کرد بوو بۆ شەڕی ناوخۆ (شەڕی کورد بە کورد بەکوژدان)، هیچ حزبێك نی‌یە لەگەلّ حزبێکی‌تردا (ناکۆکی تارادەی شەڕ) لە نێوانیاندا دروست نەبووبێت، ماوەیەکی زۆر پێوەی خەریك بوون، بۆتە هۆی لەدەست دانی ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگەو کادرانی لیّ هاتووی خەباتگێری چەندەها سالّ.

کورد بەهۆی (شەڕی ناوخۆیی)ەوە شەڕی داگیرکەرانو دوژمنانیو تەنانەت زولّمی داگیر کەرانیشی لەبیر چۆوە "ترسناکترین قۆناغ" لەشەڕی ناوخۆدا گواستنەوەی شەڕ بوو لە شاخەکانەوە بۆ شارەکان، وە پەك خشتنی ژیانی ئاسایی هاوولاّتیانو بەدەست نەکەوتنی خۆراكو وەستاندنی کاری دامو دەزگاکانی حکومەتو دروست بوونی حالّەتی نایاسایی‌و...هتد.

ئەمانەو چەندەها (دیاردەی سلبی)تریش کەلە ئەنجامی مالّ وێرانی شەڕەوە، هاتنە ئاراوە کە دەرئەنجامەکەی کاریگەریەکی ڕۆحی هەبوو لەسەر دەرونی خەلّکی کوردستان بە گشتی، کە بووە هۆی سارد بوونەوەو لەبیر چوونەوەی خەلّکی بۆ کێشە ڕەواکەیان... وەدیاردەی کۆچ کردن بەرەو هەندەرانو...هتد.

بەلاّم لەگەلّ ئەمانەشدا مەبەست ئەوە نی‌یە لە بایەخی شۆڕشو قوربانی بەردەوامی گەلەکەمان کەم بکەینەو، مەبەست لە چۆنیەتی چارەسەر کردنی

کێشەی گەلەکەمانە، گەیشتن بە ڕێگەیەکی مەنتقیانە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە دورو نزیکەکانمان.دەبێت بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد (حزبەکانمان بەتایبەتی) گۆران لەبەرنامەو شێوازی خەباتیاندا بکەن بە جۆرێك لەگەڵ بارودۆخی نوێی هەرقۆناغێکدا بیگونجێنن، وەلەگەڵ بەرژەوەندی باڵای میللەتەکەماندا هاوتا بێت.

وە چۆن بتوانین سود لە یاسا نێو دەوڵەتیەکان و بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان وەربگرین، بۆ ئەو مەبەستە هەموو کەلێنێکی یاسایی بقۆزێتەوە، چۆن بتوانرێت (ئیلزامیەتی) دەوڵەتانی داگیرکەر بە بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتوەکان و دۆسیەی مافەکانی مرۆڤەوە، جەختی زیاتری لەسەر بکرێت، چونکە داگیر کەرانی کوردستان ئەندامن لە نەتەوە یەکگرتووکان، وەخۆیان پەیوەست کردووە بە ئیمزا کردنی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ. "چۆن بتوانین" بۆ پاڵپشت کردنی داواکارییەکانی گەلەکەمان، پشت ببەستین بەو جۆرە (ئیلتزام) کردنە لە هەر پارچەیەك لە پارچەکانی کوردستاندا بێت. هەرچەندە بابەتی توێژینەوەکەی من زیاتر جەخت لەسەر باشووری کوردستان (کوردستانی عێراق) دەکات بەهۆی ئەو هەل و مەرجە بابەتیەی کە ئێستا بۆ کوردەکانی عێراق رەخساوە (خەونێکی دوور) بوو، نابێت ئەم هەلە لەکیس گەلەکەمان بدرێت (مێژوو بە دەگمەن) ڕووداوی لەو چەشنەی تێدا دووبارە دەبێتەوە. وەنابێت بەهۆی بەرژەوەندییە ناوەکی یەکان. هیوای میللەتێك ژێر خاك بخرێت.

دەگمەنە جارێکی تر بارودۆخی مێژووی لەباری وا بۆ کورد برەخسێت، وەلە کیس دانی، تاوانێك دەبێت بەرامبەر بە مێژوو، بەگەل، بە شەهیدان و دەکەوێتە ئەستۆی هەمووان بەبێ جیاوازی.

بوونی کێشەی کورد لە هەر پارچەیەکدا، بێگومان کاردەکاتە سەر پەیوەندی ئەو دەوڵەتانە کە کوردستانیان داگیر کردووە لەگەڵ یەکتریدا. وە زۆر جار کار

گەیشتۆتە سەر رادەی بەیەکدادان (وەلە هەموو کاتێکدا کوردستان شانۆی بەیەکدادانی هێزی داگیر کەرەکان بووە).

کە ئەمەش بێگومان گەورەترین کاریگەری هەبووە، لەسەر کۆمەڵگای کوردەواریو هەڵتەکاندنی بنەمای ئابووریو شێواندنی روخساری شارستانیەتو کەلەپوورو رۆشنبیری میللەتێك (کە هەوڵی مانەوی خۆی دەدات)و لە پێناوی مانەوەی خۆیدا خەبات دەکات. ئێستا ئەوەی تێبینی دەکرێ لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیدا، وبۆتە سیفەتی زاڵ لە پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکاندا، زیاتر ئارەزووی ئەوە دەکرێت بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان، بەرێگەی ئاشتی لە پێناوی بەدیهێنانی بەرژەوەندی کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی لە "ئاشتیو ئاسایشو جێگیر بوون"دا.

## گرنگی ئەم توێژینەوەیە :

یەکەم (پاڵپێوەنەری) سەرەکیم بۆ هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بۆ خستنە رووی کێشەی نەتەوەکەمەوە. کێشەی یەکێك لە نەتەوە چەوساوەکان، کێشەی زوڵم لێ کردنی نەتەوەیەك (لەلایەن داگیرکەرانی ناوچەکەو وڵاتە زلهێزەکانی جیهانەوە).

وەمەبەستم لە خستنە رووی مافی چارەی خۆنوسین بە گشتی، و چۆنیەتی پراکتیك کردنی بەسەر گەلانی تردا، وەبوونی ئەم پرەنسیپە لە "بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان"دا وچۆنیەتی پراکتیك کردنی لەسەردەمی (کۆمەڵەی گەلاندا)وە دەرخستنی بڕیارەکانی (کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان)زیاتر جەخت کردنیان لە چەسپاندنی ئەم پرەنسیپەدا.

پاشان رەوا بوونی ئەم مافە بەکورد، ئایا کورد مافی ئەوەی نی‌یە چارەنوەسی خۆی دیاری بکات؟ وەیان بۆی دیاری بکرێت ئایا کورد داوای شتێك دەکات کە

نەشیاوە؟ وەیان هێنانەدی داواکارییەکانی شتێکی مەحاڵە؟ ئایا ئەو داواکارییەی کورد مەبەستێتی لەگەڵ پرەنسیپو ئامانجە سەرەکیەکانی کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیدا ناگونجێت؟ لەکاتێکدا کورد هەموو خەسڵەتێکی نەتەوەو هەموو بنەماکانی دەوڵەتی، تێدا بەدی دەکرێتو تیایەتی، ئیتر بۆ دەبێت کورد لە رەواترین مافی بێبەش بکرێت؟ کە خۆی لە خۆیدا دژی مافەکانی مرۆڤو بڕیارەکانی (کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانن) کە سیفەتی ئیلزامیان هەیە.

ئایا دەتوانرێت کێشەی کورد لەبەر رۆشنایی (بەڵێن نامەی نەتەوە یەکگرتووەکان)و رێسای یاسا نێو دەوڵەتیەکاندا چارەسەر بکرێت؟

ئەمەو چەندەها پرسیاریتر لە دووتوێی ئەم باسەدا ئاماژەم بۆ کردووە.

وەهەوڵم داوە شێوازێکی زانستیانەی بێلایەن پەیڕەو بکەم.

توێژینەوەکەم کردووە بە دوو بەشی سەرەکییەوە:

بەشی یەکەم: تایبەتە بە مافی چارەی خۆنوسین لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیدا.

لەم بەشەدا. ویستوومە بەپێی پێویست مافی چارەی خۆنوسین دەربخەم، لە چۆنیەتی ئاماژە بۆ کردنی لەلایەن فەیلەسوفو رووناکبیران. وچۆن پێناسەی (مافی چارەی خۆنوسین)یان کردووە.

پاشان دیدی رۆژئاواو وڵاتانی سۆشیالیست بۆ چەمکی مافی چارەی خۆنوسین، وەهەوڵدان لە پێناوی تێگەیشتن لە مافی چارەی خۆنوسینو تێگەیشتنی مارکسیزم بۆ نەتەوە..هتد.

ئەمە سەرەرای ئەوەی ئاماژەم بۆ پێك هاتەی مافی چارەی خۆنوسین کردووە. هەر لە چەمکی دەوڵەتی تازەو بیرو باوەڕی دیموکراسیو سەربەستی تا دەگاتە سەروەری نیشتمانی و (جەختم) لەسەر مافی چارەی خۆنوسین کردووە هەر لە دەرکەوتنی رێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان (کۆمەڵەی گەلانو نەتەوە یەکگرتووەکان)

وەچۆنیەتی گرتنە خۆیان بۆ ئەم پرەنسیپە بە تایبەتی لەسەردەمی "نەتەوە یەکگرتووەکاندا".

که بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ئاماژەی بۆ دەکات، و دەرخستنی مافی چارەی خۆنوسین لە ژێر سێبەری بەڵێننامەدا (المیثاق) سەبارەت بەوەی کێن ئەوانەی کە مافی دیاری کردنی چارەنوسیان هەیە؟ وەئایا ئەو دەسەڵاتەی کە دان دەنێت بەم پرەنسیپەدا کێیە وچۆنیەتی پابەند بوون بەم پرەنسیپە "ئایا مافە یان پرەنسیپە".

وە خستنە رووی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بە مافی چارەی خۆنوسین وە هەڵسەنگاندنی مافی چارەی خۆنوسین بە شێویەکی گشتی لەیاسای رێکخراوە نێو دەوڵەتیەکاندا.

پاشان هۆیەکانی پەیڕەو کردنی مافی چارەی خۆنوسین (هەر لە لیژنەی لێکۆڵینەوە-الوصایە (پێسپێری)-هەڵبژاردن- پاشان گەرانەوە بۆ گەل)وە لە کۆتاییدا بەبەکارهێنانی شێوازی راپرسی ریفراندۆم.

وەکۆتایی ئەم بەشە (بەشی یەکەم) بە مەرج و کۆسپەکان دەبێت.

سەبارەت بە مەرجەکانی (مافی چارەی خۆنوسین).

ئەمانە دەگرێتەوە "زەوی، دانیشتوان، ویستی هاوبەش، وەخەباتی یەکگرتوو- رای گشتیو پڕوپاگەندە" پاشان ئاماژە کردن بۆ کۆسپەکان...

سەبارەت بە (بەشی دووەم)

ئەم بەشە تایبەتە بە مافی چارەی خۆنوسینی کورد..

وەلەم بەشەدا: سەرەتا باسم لە کورتەیەك لە مێژووی گەشەکردنی کۆمەڵگای کوردەواری لە قۆناغی کۆیلایەتیو دەرەبەگایەتیدا کردووە.

پاشان دێمە سەر باسی کێشەی کورد لەبەر ڕۆشنایی پەیوەندیو پەیماننامە نێو دەوڵەتیەکاندا لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە.

وەمافی چارەی خۆنوسینی کورد لە پەیمننامە نێو دەوڵەتیەکاندا بەتایبەت (پەیماننامەی سیڤەر)

پاشان (جەختم) لەسەر سیاسەتی وڵاتە زلهێزەکان کردۆتەوە دەربارەیمەسەلەی کورد بە گشتیو (ولایەتی موسڵ) بە تایبەتی بەهۆی دۆزینەوەی نەوتەوە لەو ناوچەیەدا. وهەوڵی کورد بۆ پێك هێنانی دەوڵەتی تایبەت بەخۆیان وەباس کردنی چۆنیەتی پێك هێنانی (لیژنەی تایبەت بە لێکۆڵینەوە) لەلایەن (کۆمەڵەی گەلانەوە) سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ.

پاشان دەرخستنی هەڵوێستی نێو نەتەوەیی دووەم دەربارەی مەسەلەی کوردو چۆن پشتیان لە کورد کرد. وە دوا بابەت دێمە سەر باسی هۆکارەکانی تێك شکاندنی شۆڕشەکانی کورد بە گشتی.

پشان دەرئەنجام–و کۆتایی

سەرچاوەو پەراوێزەکان.

## پیلانی توێژینەوە:

- پێشکەشە
- پێشەکی
- بەشی یەکەم: مافی چارەی خۆنوسین لە یاسا نێودەوڵەتیەکاندا

١- مافی چارەی خۆنوسین لەلای فەیلەسوفو ڕووناکبیران.

١-١ ویست.

١-٢ ویستو سەربەستی.

٥- پێك هێنانی لیژنەی تایبەت بە لێكۆڵینەوە لەلایەن كۆمەڵەی گەلانەوە.

٦- نێو نەتەوەیی دووەم و مەسەلەی كورد.

٧- هۆكارەكانی تێك شكاندنی شۆڕشەكانی كورد بە گشتی.

دەرئەنجام

كۆتایی

پەراوێز

سەرچاوەكان

## ١-مافی چارەی خۆنووسین لەلای فەیلەسووف و رووناکبیران

ئاشـــکرایە هیـــچ پرەنســـیپێك لــە بارودۆخــە مـــادیو مرۆڤایەتیەکـــەی جیاناکرێتەوە.

ئـابووری، رامیـاری، بـیر، کۆمـەڵ ئەمانـە هـەمویان تێهەڵکێشـی یـەکترن، بەیەکەوە هۆکاری کاریگەرن ئەمە جگە لەوەی لە هەمان کاتیشدا کاردەکەنە سەر (تاکە کەس و کۆمەڵ و بارودۆخەکەی).

لێرەدا فەیلە سووف و رووناکبیران چەقی ئەو کۆبونەوەیـە پێـك دەهێنـن وە خـاڵی بەیـەك گەیشـتنی هۆکارەکـانن، وەلـە رێگـەی ئەمانـەو پـەیوەندی دروسـت دەبێت، وەخـەڵك فێر دەکرێـت و بیرو بۆچوونـەکان دەگەیـەنرێت بە مرۆڤایـەتی لـە شێوەی بیردۆزی فەلسەفی و زانستیدا.

ئەوەی بیری رووناکبیرانی داگیر کردبوو بۆ ماوەیەکی زۆر گرنگی دان بوو بە چۆنیـەتی (فـێرکردن و رۆشـنبیر کردنـی خـەڵکی و سەربەسـتی و شـێوازی حوکـم

کردن.. هتد). وەهەر گرنگی پێدەدەن مادام ناکۆکی پرەنسیپەکان بەردەوام بوونی هەبێت.

شۆڕشـی فەلسـەفی لـە گەشـەکردندا بـوو، بـەڵام لەسـەدەی (نۆزدەیـەمو بیسـتەمدا) گەیشـتە پۆپـەو ئەوپـەری گەشـەکردنی، لـە فەیلەسـوفەکانی ئـەو سەردەمەدا (هیگل، جون ستیوارت مل، کارل مارکس، شارل مۆنتیکۆ (أ)، جـان جاك رۆسۆ، أکتون، رینان، لینینو لاوسکی...)

## ١-١ ویست (الارادە)

ئەمانویل کانت (١٧٢٤-١٨٠٤)... (ب)

فەلسـەفەکەی لەسـەر بناغـەی (علمانیـەتو مرۆڤایـەتی) دانا بـوو، یەکێك بـوو لەوانـەی کـە بـانگ هێشـتی ئـەوەی دەکـرد، دەبێـت جیاوازی بکرێـت لـە نێـوان (خوروەشت -الاخلاق- زانیاری -معریفە-)وە لە ڕێگەی ئەم جیاوازیەوە گەیشتن بوو بە مانای سەربەستی (کانت) دەڵێت:

مـرۆڤ سەربەستە کـاتێك یاساکانی خورەوشت پـەیڕەو دەکـات، چونکە ئـەو یاسایانە لە خودی خۆیەتی لە جیهانی دەرەوە نی‌یە.

لەبەر ئەوەی هیچ شتێك نە لە جیهاندا وەنە لە دەرەوەی‌دا، ناتوانرێت هەستی پێبکرێتو ناوی لێ بنرێت بە چاکی، بەبێ (خۆگرتنەوە-تحفظات) تەنها ویستی باش نەبێت.

بـە پـێی ئـەم بـیردۆزەی کـانت، تاکـە کـەس (فـرد) شـوێنێکی بـەرزی پـێ دەبەخشێتو حوکمی دەداتێ. گرنگی دەدات بـەخۆ دۆزینـەوەی تاکـە کـەس، وەك

بوونەوەرێکی خاوەن خورەوشتی سەربەست. وەلەم بارەیەوە وتویانە : (کانت) زۆر شۆڕشگێر تر بووە لە شۆڕشگێرانی شۆڕشی فەرەنسا تەنانەت لە (رۆبسبیر)یش. سەبارەت بە شێوازی حوکم کانت دەڵێت:

دەبێت مرۆڤ سەربەست بێت، بۆ ئەوەی فێر بێت لە چۆنیەتی بەکار هێنانی تواناکانی، بە رێگەیەکی سەربەست و سود بەخش. وەمافی چارەی خۆنوسین باشترین چاکە دەبێت لە سیاسەتدا. وە کانت پاساوی بۆ دەهێنێتەوە بۆ گەیشتن پێ ی لە رێگەی بەکارهێنانی هەموو رێگاکان. چونکە گرنگ خودی حوکمەکەو جۆری ئەو حوکمە نی یە بەڵکو گرنگ شێوازی گەیشتنە، یان ئەو رێگەیە کە حوکم بەدەست دەهێنرێت کە دەبێت لە ویستێکی سەربەستەوە بێت..

## ١-٢ ویستو سەربەستی

جۆن سیتوارت مل (١٨٠٦-١٨٧٣) ئەم فەیلەسوفە دوای (جۆن لوك) هات. (مل) بانگهێشتی بۆ دەستورو حوکمی دیموکراتی دەکرد، یەکێك بوو لەوانەی لە فەلسەفەکەیدا زیاتر جەختی لەسەر سەربەستی دەکرد. ئەمە جگە لەوەی لە زانستی دەروونزانیو فەلسەفەی رامیاریشی کۆڵیوەتەوە.

(مل)پێناسەی سەربەستی کردووەو دەڵێ:

(ئەو دەستورەیە کە نیشتمان پەروەرەکان، ئامانجیانە دیاری بکەن، بۆ ئەو دەسەڵاتەی کە فەرمانڕەواکان پراکتیکی دەکەن لە کۆمەڵگادا). (مل) دژی دەسەڵاتی رەها (مطلق) بوو جا ئەگەر سەرچاوەکەی بێگانە یان دانیشتوانی دەوڵەتەکە خۆیان بن.

(مل) گرنگی دەدا بە چۆنیەتی دیاری کردنی داواکارییەکانی سەربەستی ئەویش لە رێگەی:

١.بەدەست هێنانی دان پیانان بە (حصانات)ە سەرەکیەکان کە بریتین لە (سەربەستیەکان و مافە سیاسی یەکان).

٢.بەدەست هێنانی دڵنیایی (ضمانات)ی دەستوری، وەهەر لە رێگەی ئەم جۆرە دڵنیاییەوە (مل)داوای نوێنەرایەتی پەرلەمانی دەکرد، وەبڕوای وابوو دەبێت حوکم لە "گەل"ەوە بێ وبەرژەوەندیو ویستی فەرمانڕەواکان هەمان بەرژەوەندیو ویستی گەل بێت.

وە هەر لەم روانگەیەوە (پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین) بە پراکتیک دەکرێت یان هەر هیچ نەبێت هاوچەشنە لەگەڵ (چەمکی دەوڵەتی نەتەوەیی) لەو کاتەدا. یەکێك لەوانە رەخنەیان لە بیردۆزەکەی (مل)دەگرت. "لۆرد ئاکتۆن ئەنبری" بوو کە دەڵێت:

بۆچوونەکەی مل شایاتی رێزو لێ گرتن نی یە، وەبە شێوەیەکی گشتی بەکەڵکی جێبەجێ کردن نایەت. چونکە ئاکتۆن لەو بڕوایەدا بوو کە بوونی سەربەستی سیمای کۆمەڵگایەکی مەدەنیەتو پێشکەوتوو دەنوێنێت. (مل) لە وەڵامدا دەڵێت:

هەرکاتێك هەستی نەتەوایەتی بەشێوەیەك بەهێز بوو، حاڵەتێکی زۆر پێویستە هەر لە یەکەم ساتەوە بۆ دروست کردنی حکومەتی نەتەوەیی.

هەر چەندە لە نێوان (جون ستیوارت مل و ئاکتۆن ئەبنری) ناکۆکیو جیاوازی جەوهەری نەبوو لە بیرو بۆچوونەکانیاندا. ئاکتۆن دەڵێت: ئەگەر دەوڵەت بێتوانا بوو لەبەدەست هێنانی رەزامەندی ئەو هەموو رەگەزە جیاوازانەی دەیان گرێتەخۆ، ئەوا فەرمانی مردن بەسەر خۆیدا دەدات. وەلە شوێنێکیتردا دەڵێت:

ئەگەر دەوڵەت نەیتوانی هەموو رەگەزە جیاوازەکانی "پێك هاتەی میللەتەکە" بگرێتەخۆ. بناغەیەکی سەرەکی تێدا ون بووە بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی خۆیی.

ئەو سەردەمە رەنگ دانەوەیەکی تایبەتی هەموو لە باس کردنی (حکومەتی نمونەیی)دا کە دایەلۆگێکی توندی دروست کردبوو لە نێوان نیشتمان پەروەرەکان و نەتەوەییەکاندا...

## ١-٣ بەرژەوەندیو پرەنسیپەکان

لەلای (جان جاك رۆسۆ): گەل بریتی‌یە لە کۆمەڵێك خەڵك کە بە ویستی خۆیان رێکەوتوون بۆ بەیەکەوە ژیان. "رۆسۆ" بە یەکێك لە دیارترین روناکبیرانی شۆڕشی فەرەنسا دادەنرێت هەرچەند لە سەرەتا زۆربەی ئەڵمانیەکان بیردۆزەگەیان رەت کردەوە لبەر چەند هۆیەکی سیاسی.

بەڵام لەلای هەندێکی‌تر پەسەندیان کرد لەوانەش فەیلەسوفەکانی وەك (کانت-هیگل) وە وبەریتانیایەکان "ئەوانەی سەر بە قوتابخانەی ئۆکسفۆر بوون" وەك (بوسانکی-گرین) بە شێوەیەکی گشتی ئەمان زۆر لە بۆچوونەکانی رۆسۆ کاری تێ کردبوون.

"رۆسۆ" لە پەیمانی کۆمەڵایەتی‌دا دەڵێت:

مرۆڤ بەسەربەستی لەدایك دەبێت، کەچی لە هەمووشوێنێك دا کۆت و زنجیر کراوە. دەڵێت (برنادشۆ) کاتێك ئەم وتەی (رۆسۆ)ی خوێندەوە وتوویەتی: ئەمە گەورەترین درۆیە کە پیاوێکی عاقل کردبێتی.

مرۆڤ لە دایك دەبێت، لەگەڵ لە دایك بوونیدا کۆمەڵێ لە داب و نەریت و بوونی دەوڵەمەندی و هەژاری و هەڵبژاردنی ئایین، ئەمانەی بە میراتگری بۆ ماوەتەوە لە گەڵیدا دێنە دنیاوە، ناتوانێت بە ئاسانی خۆی لیچپیان رزگار بکات.

رۆسۆ یەکێك بوو لەوانەی کە بڕوایەکی تەواوی بە (دیموکراتیەتی راستەوخۆ) هەبووە. وە لە ئەنجامی بیردۆزی (ویستی گشتی-الاراده العامه) رۆسۆ داوای هەڵبژاردنی راستەوخۆی بۆ ئەنجومەنی یاسا دانان و هەڵبژاردنی راستەوخۆ بۆ ئەنجومەنی (راپەراندن) تنفیدی دەکرد.

## ٤-١ راست رەو چەپ رەو

راست رەو چەپ رەو دوو بۆچوونی لەیەك جیاوازن، راست رەوەکان کێشەیان ئەوە بوو چۆن بتوانن ئازادی لەگەڵ بوونی سیستەمێکی کامڵ بوودا بگونجێنن.

یەکەم هەوڵ دانیان لەم بوارەدا گرتنە خۆی پرەنسیپی (بوار یان رێگەی کارکردن بدە). لەو بڕوایەدا بوون خەڵك ئەگەر سەربەستیان بدرێتی و بۆ خۆیان بەجێ بهێڵرێت چارەنوسیان دیاری بکەن، ئەوا ئەو کاتە دەتوانن لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیدا بیگونجێنن.

بەڵام ئەمە لە بواری سیاسیدا بەرەو جۆرێك لە پەیدا بوونی حاڵەتی (فوضی) دەڕوات تەنانەت لە ئابووریشدا ئەگەر وا دابنرێت کە هەڵسوکەوتی مرۆڤی ئابوری بەرەو رێرەوی (جەبری-زۆرەملێ) دەڕوات. بەڵام ئەم زۆرەملێ یە دەرکەوت دژی چەمکی (ویستی سەربەست و سەربەستیە).

کاتێك راست رەوەکان خۆیان دانیان نا بەو جۆرە کەم و کورتیەدا، دانیان نا بەوەی پێویستە دەوڵەت (تدخال) بکات واتە رێگایان بەدەست تێوەردان و هاتنی ناوەوەی دەوڵەت دا ئەمەش لە رێگەی (پیلان دانانەوە-تخطیط). لەسەدەی

هەژدەیەمدا راست رەوەکان بە تەنها بەدەست پێ کردنەوەی شۆڕشکان نەوەستان، بەڵکو هەوڵیان دا بۆ سەرلەنوێ داڕشتنەوی پیلانی دوا ڕۆژو سەرلەنوێ نوسینەوەی مێژوو بۆ ئەوەی بتوانرێت (تفسیر-لێکدانەوە)ی کۆمەڵگا بەتەواوی بکرێت.

ئەمانە ئامانجیان لێکدانەوەیکی مادیو مەنتیقیانە بوو و "مارکسیزم" دەرپەراندنێکی گەورە بوو بۆ راست رەوەکان. مارکس دەڵێت: مێژوو دەتوانرێت دابەش بکرێتە سەر سێ سەردەم ئەوانەش بریتین لە:

سەردەمی یەکەم.. سەردەمی دەرەبەگایەتی، لەم سەردەمەدا بوونی هێز لە (خاوەنداریێتی زەوی)دا یە. مرۆڤی کارکەر پاشکۆی گەورەکەیەتی پاشکۆیەتیەك کە هەمان دابو نەریتو ئایینو پێداویستی حوکمی دەکات.

سەردەمی دووەم.. (سەردەمی شارستانیەت-عصر الحضارة) دێت لەم سەردەمەدا (چینی ناوەراست-بۆرجوازیەت) تیایدا دەردەکەوێت. لەم سەردەمەدا هێز لە (سەرمایەی پیشەسازی)دا کۆ دەبێتەوە، کرێکار دەبەسترێتەوە بە "خاوەن مڵك" وەئەمەش لە رێگەی (گرێ بەست-عقد)ێکی نەگونجاو (چونکە یەکسانی لایەنەکانی تێدا بەدی ناکرێت)..

سەردەمی سێیەم.. سەردەمی دیکتاتۆریەتی چینی کرێکاران (دیکتاتۆریەتی پرۆلیتار) دێت.

ئەو کاتەی کرێکاران دەسەڵات بگرنە دەست، دەوڵەت هەموو هۆکارەکانی بەرهەم هێنانو دابەش کردنی لەبەر دەستا دەبێتو دەسەڵاتی بەسەربانددا دەبێت.

لەم سەردەمەدا بەرە بەرە دەوڵەت بەرەو نەمان دەچێت، وەهەریەکە لە (سەربەستی -الحریە-)و سیستەم (النظام)لە جیهانێکی میساڵیدا یەك دەگرنەوە. وەتەنانەت مارکس هەموو سەردەمەکانی پێش

ئەم سەردەمە (سەردەمی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتار) ناویان لێ دەنێت (سەردەمی پێش مێژوو).

سەبارەت بە دیاری کردنی (مافی چارەی خۆنووسین) لە نێوان راست رەوەکان خۆشیاندا (نقاش)ێکی توند پەیدا بوو، وەبەهەمان شێوە لەسەر (پرەنسیپ و واقع و ناکۆکیە ناوخۆیی و دەرەکیەکان)یشدا.

ئەو تەنگەژەیەی راست رەوەکان تیایدا دەژیان. لەنێوان "رێرەوی گشتی و چەمکی جیهانگەرێتی لە ناکۆکیە چینایەتیکان و کێشە نەتەوەییەکاندا بۆ سەربەخۆ بوون و دیاری کردنی مافی چارەی خۆنووسین بوو.

مارکس، بەربەرەکانیە ناوخۆییەکان دەگەرێنێتەوە بۆ (سەردەمی پێش مێژوو) دەڵێت: (کرێکار بووە بە مرۆڤێکی جیهانی راست گۆ، نەتەوەیی بە شێکە لە (باوەڕ-عقیدە)ی بۆرجوازیەت ئەمانەش خۆی لە خۆیدا بریتی یەلە کەم و کورتی ژیرایەتی).

لەگەڵ ئەمانەشدا هەر مارکس خۆی بوو لایەنگری هەندێ لە بزوتنەوەکانی دەکرد لە رووی تەکتیك و بارودۆخی قۆناغی یەوە کە پیایدا تێ پەرین. پاشان (لینین)هاتن دەتوانین بڵێین (تەنگژەی راست رەوێتی و تەنگژەی تیۆری و -واقعیەت-)لە سەردەمی لینین بە باشترین شێوە خۆیان دەنوێنن.

لینین دەڵێت.. (روسیا چینی پرۆلیتار دەنوێنێت-وە (چینی پرۆلیتار)ش حزبی شیوعی دەنوێنێت کەواتە حیزبی شیوعی دەوڵەتی سۆڤیەتی یە وە رووسیاش وڵاتێکی دیموکراسی یە)، بەڵام پاشان دانی بەوەدانا کە دیکتاتۆریەت یەکێکە لە مەرجەکانی شۆرش.

وە دەڵێت.. فەرمانرەواکان ئێستا گرنگی بە (سەربەستی و دیموکراسیەت) نادەن، لەم کاتەدا لینین لە نوسینێکی دا لە ژێر ناونیشانی (بۆچوونەکانم لەسەر

سیاسەتی نەتەوەیی)دەڵێت.. ئێمەی دیموکرات خوازە سۆشیالیستەکان دوژمنی هەموو (نزعات)ێکی نەتەوەین وەلایەنگری دیموکراسیەتی ناوەندین.

لینین درەنگ درکی بە گرنگی پێلێنان بە مافی چارەی خۆنوسیندا کردو دانی پیادانا. ئەمەی لێکدەدایەوە بەوەی کە شۆڕشی پرۆلیتاری شۆڕشی جیهانی‌یەو بەشێوەی شۆڕش دەست پێدەکات لە سنوری ناووەی هەرێمەکاندا کە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی جۆرێك لە سۆشیالیتی لە ناو ئەو سنورەدا.

وەدەتوانین لێکدانەوەی بۆچوونەکانی لینین لە ڕێگەی هەردوو تیۆری (ماف)و تیۆری (ئیمپریالیزم) لێك بدرێتەوە. لینین دژی مارکسیە تیۆرییەکانی وەك (ڕۆزا ئۆکسمبۆرگ)وە (دیکتاتۆری بیرۆکراتی) وەك (جۆزیف ستالین) بوو. ستالین بۆ کۆمارەکانی غەیری رووسی لە ئۆتۆنۆمی زیاتر سەربەخۆیی پێنەدەدان بە پێچەوانەی لینین کە داوای سەربەخۆیی بۆ کۆمارەکان (جمهوریان) دەکرد. ستالین زۆر لە لینین لینینی‌تر بووە، بەڵام لینین لەو زیاتر مرۆڤایەتی‌تر بوو. لینین مردو کۆتایی بە شەڕی قسە نەهێنابوو. مەسەلەی (مافی چارەی خۆنووسین)یش لە نێوان باوەڕ پێهێنان‌و واقعیەت دا بە هەڵواسراوی مایەوە.

## ١-٥ رای ناوەند

لەم مەسەلەیەدا دان نانە (بەمافی چارەی خۆنووسین) لەگەڵ سووك کردن‌و کەم کردنەوەی توندو تیژی نەتەوەیی. هەروەك چۆن (ئاکتۆن) بانگەشەی (امتصاص)ی نەتەوەکانی دەکرد ئەویش لەڕێگەی یەکسانی‌و داننان لە کەلەپووری شارستانیەتی نەتەوکان. وەیان چۆن لینین بانگەشەی سەربەخۆیی کەلەپوورو ڕۆشنبیری‌و یەکسانی ئابووری‌و قەوارەی هەرێمایەتی بۆ کۆمارەکانی سۆڤیەتی دەکرد. پاشان لاوسکی دێت..

لاوسکی پێش بینی ئەوەی دەکرد ئەگەر پەیوەندییە کئابووریەکان لە نێوان کۆمەڵەکاندا چاك نەکرێت، وە چاوێك نەخشێنرێتەوە بە پەیوەندیەکانی بەرهەم هێناندا و گونجاندنی تێدا نەکرێت. ئەوا جیهان گەورەترین ناکۆکی بەخۆیەوە دەبینێت، بەربەرەکانی لە پێناوی مانەوەی نەتەوکاندا.

هەروەها لە شوێنێکیتردا دەڵیت: (ئێمە لە راستیدا لە جیهانداین، کە بەرەو ناخی کێشەکان رۆدەچێت، زۆر قوڵتر لە کێشەی سنورەکانو خۆ پڕ چەك کردنو مەسەلەی کەمینە نەتەوییەکان، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرمان فێری بیرکردنەوە بین، کە ئەم مەسەلانە تەنها خستنە رووی کێشەیەك کە زۆر لەوانە قوڵترن کە دەبێت روو بە روویان ببینەوە).

پاشان دێتە سەر مافی چارەی خۆنووسین.. ئەو مافەیە هەر وەك (موسوعه) ئاماژەی بۆ دەکات، ئەو پرەنسیپەیە کە ئاماژە بۆ مافی هەموو میللەتێك دەکات کە سەربەست بێت لە هەڵبژاردنی حکومەتو رژێمی سیاسیو ئەو شارستانێتەی لەگەڵیدا دەگونجێتو پێویستی پێیەتی.

## ٢.پێناسە کردنی مافی چارەی خۆ نووسین

ئینسایکلۆپیدیای بەریتانی، پێناسەی مافی چارەی خۆنووسینی کردووەو دەڵێت.. مافی چارەی خۆنووسین یەکێکە لەو پرەنسیپانەی، لەگەڵ شەڕی جیهانی یەکەمدا سەری هەڵداوە، کە ئاماژە بۆ مافی میللەتان دەکات، لە هەڵبژاردنی سەربەستی خۆیاندا، هەروەها هەڵبژاردنی حکومەتو رژێمی رامیاری ئەو شارستانیەی کە بەلایانەو چاکەو پێویستیان پێیەتی..(١)

یەکێك لە پێناسەکانی‌تر دەڵێت.. مافی چارەی خۆنووسین یەکێکە لەو پرەنسیپانەی کە بانگهێشتی مافی هەموو گەلان دەکان لە دیاری کردنی سەروەران (بەپشت بەستن بە خۆیان)، بەبێ هیچ کارێکی دەرەکی وەیان دەست تێوردانی بێگانە بە هەر شێویەك بێت..(۲)

کەواتە مافی چارەی خۆنووسین ئەو پرەنسیپەیە کە رێگە بەکەسانی وەیان (ئەندامانی) میللەتێك دەدات کە مافی هەڵبژاردنی شێوازو رێچکەی رۆشنبیری‌و کەسایەتی‌و نیشتمانێتی خۆیان هەبێت‌و رێکخستنی پەیوەندی‌یە نێو دەوڵەتیەکان لە لایەك‌و لەلایەکی‌تریشەوە دیاری کردنی جۆری ئەو (ئۆتۆنۆمیەی) کە تیایدا سەروەری بۆ گەل بەدەست دێنێت..(۳)

ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەو ئامانجەی کە ئەم پرەنسیپە تێ هەڵکێشە لەگەڵ هەردوو بۆچوونی سەروەری نەتەوەیی‌و دیموکراتیەتدا کەواتە ئەم پرەنسیپە (مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوە) دەگرێتەوە.

لەسەرەتادا هاوپەیمانەکان لە جەنگی جیهانیدا کە ئەم پرەنسیپەیان هێنایە کایەوە، بۆ ئەوەی هۆکارێك بێت بۆ شێوازی پروپاگەندەی سیاسی خۆیان، کاتێك بەبەشێك لە بەرنامەی خۆیان دانا، کاریان بۆ دەکرد لە پێناوی رزگار کردنی گەلانی رۆژهەڵات‌و ناوەراستی ئەوروپاو گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەراست.

یەکەم ئامانجیان بۆ گورز وەشاندنی خۆیان بوو بۆ خۆبردنە پێشەوەو چۆنیەتی بەدەست هێنانی سۆزو پشتگیری گەلانی ژێر دەستەو زۆر لێکراوی وڵاتە لاوازەکان.

بەڵام ئەم پرەنسیپە هەر لە بواری پروپاگەندەی سیاسی‌و سەربازی نەمایەوە، بەڵکو بواری فکری‌و رێکخراوەیی (ئەوروپاو ئەمریکاو ئاسیا)یشی گرتەوە.

وەبەچاکترین بوار دادەنرا بۆ بەدەست هێنانی ئاشتی راستەقینەو داد پەروەریانەی هەمیشەیی کە سەرتاسەری جیهان بگرێتەوە..(٤)

گۆرانکاریە سیاسیەکانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم، یارمەتیدەرێك بوو بۆ زیاتر گرنگی دان بەم پرەنسیپەو گەیاندنی بەو ئاستەی کە ئێستا هەیەتی، جائەگەر لە ئاستی نەتەوەیی یان پەیوەندی‌یە نێو دەوڵەتیەدان دا بێت.

ئەوەی شایانی باسە کە هاوپەیمانەکان لە کاتی بانگ هێشتیان بۆ ئەم پرەنسیپە، لەو بروایەدا نەبوون وەیان چاوروانی ئەوەیان نەدەکرد، کە ئەم گرنگیەی لێ پەیدا بێت بەجۆرێك بووە ئەو هەرەشەیەی کە دژایەتی بەرژەوەندی داگیرکەران بکات لە دەست تێوەردان و سوود وەرگرتنیان لەسەر گەلانی‌تر..

## ٣-چەمکی مافی چارەی خۆنووسین

مافی چارەی خۆنووسین بەمانای دیاری کردنی چارەنووسی نەتەوەیی وەیان بەمانای مافی سەربەخۆ بوونی نەتەوەیی دێت، کەواتە مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەیی بەپێی ئەم چەمکە پشت دەبەستێت بە بوونی:

١.دیموکراتیەت، کە گرنگی دەدات بەوەی دەبێت رژێمی فەرمانرەوایی لە دەوڵەتدا (لێ رازی بوونی خەڵکانی فەرمانرەواکە) بەدەست بهێنن. وەك دەزانین بناغەی دیموکراتیەت دەگەرێتەوە بۆ ئەو گەشەکردن و پێشکەوتنی ژیرانەی سەدەی هەژدەیەم، هەر دیموکراتیەت بوو تیۆری سەروەری داهێنا کە (گەل) بەتەنها خاوەنی سەروەری و دەسەلاتی بالایە لە هەرێمەدا. سەروەریش لە (گەل)ەوە هەڵدەقولێت و سەرچاوە دەگرێت، چونکە تاکە کەس (فرد)سەربەستی خۆی بەدەست ناهێنێت لە ناو (گەلەکەی)دا نەبێت، کەواتە دەبێت رێگە بە هەموو

گەلێك بدرێت بۆ پێك هێنانی دەوڵەتی خۆی بەجۆرێك لەگەڵ ویست و خواستی ئەو گەلەدا بگونجێن.

٢.نەتەوە.. هەستی نەتەوایەتی بەهێزترین پەیوەستە بۆ بەیەكەوە بەسترانی ئەندامانی میللەتێك، لە یەكەیەكی یەكگرتووی گونجاودا كۆیان دەكاتەوە، بۆ بەدیهێنانی ئامانجێكی دیاری كراو كە گرنگترینیان پاراستنی (كەسایەتی نەتەوەیی ئەو گەلە)یە كە خاوەن سەروەری خۆی بێت وەك دەوڵەت، چونكە لێرەدا وا دادەنرێت كە هەموو میللەتێك مافی دیاری كردنی چارەنووسی خۆیان دەبێت لە چوار چێوەی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیاندا.

نەتەوەیی.. بناغەیەكی تازەی هێنایە كایەوە بۆ سەروەری كەپێك دێت لە داننان بە مافی كۆمەڵە نەتەوەییەكان لە چوار چێوەی یەك دەوڵەتدا، وە رەواترین شێوەی شەرعی دەوڵەت دەبێت هەموو (گەلێك) دەوڵەتی تایبەتی خۆی هەبێت، وە هەموو دەوڵەتێكیش یەك گەل بگرێتە خۆی سەبارەت بە پێوانگەی نەتەوەیی ئەمەش بریتییە لە:

١.رەگەزی (بابەتی)..

ئەمە لە كۆمەڵێك هۆكاری هاوبەشدا بەرجەستە دەبێت لەوانە بوونی (هەرێم و مێژوو، زمان، بەرژەوەندی..هتد).

٢.رەگەزی (كەسایەتی)..

ئەمەش خۆی لە هەست و سۆزی نەتەوەیی رۆڵەكانی ئەو نەتەویەدا بەرجەستە دەكات كە هۆكاری سەرەكی بەستنەوەو پەیوەست بوون بە نەتەوەوە..

## ٣-١ دیدی رۆژئاوا بۆ چەمكی مافی چارەی خۆنووسین

چەمكی (مافی چارەی خۆنوسینی نەتەوەیی) بەو شێوەیەی هەبوو، زۆر خۆی نە ئەگرت و چووە دواوە، هەتا سەردەمی جەنگی جیهانی یەكەم، كە ئەو كاتە

سەرۆك (ولسون) دەورێکی کاریگەری هەبوو، بۆ ئەوەی جارێکیتر تیشك بخرێتە سەر مافی چارەی خۆنوسین کە جەختی لەسەر ئەوە ئەکرد ئەمە (پرەنسیپی یاسایی ملزمە)وە پێویستە لەسەر هەموو دەوڵەتێك کار بکەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوییەکانی گەلانیتر. چونکە ئاشتی بەرقەرار نابێت ئەگەر دان بەم پرەنسیپەدا نەنرێت. کەواتە دەبێت گەلان ئازاد بن لە هەڵبژاردنی سیستەمی فەرمانڕەوایی تایبەت بە خۆیان، وەبڕیاری بارودۆخی سیاسیو یاسایی بەدەست خۆیان بێت.

نابێت کێشەکان بە رێگەی چەکداری یەکالا بکرێتەوە، بەڵکو دەبێت بوار بدرێت بە راپرسیێکی سەربەستانە بە مەبەستی بەدەست هێنانی ئۆتۆنۆمیەکی دیموکراتیانە لەو هەرێمانەدا. وەدەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکرێت، کە ئەم چەمکە تایبەت نییە تەنها بەو گەلانەی کە هێشتا سەربەخۆیی خۆیان بەدەست نەهێناوە. بەڵکو ئەو دەوڵەتانەش دەگرێتەوە کە پێویستیان بە پاراستن هەیە با خاوەن سەربەخۆیی خۆیان بن، بەڵام پێویستیان بە پاراستن هەیە لە (فشاری دەرەکی یان ئەو هەرەشانەی کە دەوڵەتێکی تر بەکاری دەهێنێت بە بەکارهێنانی چەك دژیان).

### ٣-٣ دیدی سۆشیالیزم بۆ مافی چارەی خۆنوسین

تێڕوانینی سۆشیالیزم بۆ چەمکی مافی چارەی خۆنوسین (هەموو میللەتێك مافی دیاری کردنی چارەنوسی هەبێت) هەندێ لە روناکبیرانو یاسا ناسانی رووس لەوانەش "فیشنکی-تونکین" دەیان وت پێویستە میللەت سەبێکتیکی بە شوێنێکی (کە سایەتیەکی یاسای نێو دەوڵەتی) دابنرێت.

بەڵام داننان بە مافی میللەتاندا لە دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسیندا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت داننان بێت بە نەتەوە وەك پرەنسیپێك کە ئامانجی پێك هێنانی "دەوڵەتی نەتەوەیی" بێت.

لەبەر ئەوەی لە بنەرەتدا مارکسیزم دژایەتی نەتەوەیی دەکرد، وئەگەر دانی پایدا نانرێت لەبەر ئەوەی بەیەکێك لە هۆکارە ئابوورییەکانی دادەنێت لە خەباتی گەلان لە پێناوی بەدەست هێنانی مافی چارەی خۆنوسیندا.

هەروەها تێروانینی بۆ ئەو بزوتنەوانەی کە داوای مافی چارەی خۆنوسینیان دەکرد، بە ئامانجێکی دانەدەنا لە خودی خۆیدا بەڵکو تەنها هەنگاوێکە لە گەشە کردنی مێژوویی‌و گواستنەوە لە قۆناغی سەرمایەداریەوە بۆ سۆشیالیستی (سۆشیالیزمی)و نێو نەتەوەیی پرۆلیتاری.

(مارکس‌و ئەنگلس) رۆڵی سەرەکیان هەبووە لە دروست بوون‌و گەشە کردنی چەمکی سۆشیالیستی وەگەشە کردنی پرەنسپی مافی چارەی خۆنوسین کە زیاتر لە بڕیارەکانی کۆنگرەی نێو نەتەوەییە سۆشیالیستیەکان بەرجەستە دەکرا. لەوانەش کۆنگرەی سۆشیالیستی نێو نەتەوەیی کرێکاران، کە لە لەندەن لە ساڵی ١٨٩٦دا راگەیەنرا کە پشتگیری تەواوی بۆ مافی هەموو میللەتان دەردەبڕێت لە دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسین دا بە سەربەستی.

کۆنگرەی یەکەمی سەربە حزبی کاری دیموکراتی سۆشیالیستی روسی لە ساڵی ١٩٠٣دا دانی نا بە پێداویستی دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسین بۆ نەتەوەکان.

ئەو کاتە (لینین‌و ستالین) دەورێکی سەرەکیان دەبینی. سەرەتای مافی چارەی خۆنوسین لەلای لینین دەگەڕێتەوە بۆ وتەکانی کە دەڵێت.. مافی میللەتانە لە دیاری کردنی چارەنوسیان‌و جیابوونەویان لە کۆمەڵەی نەتەوەییەکانی ترو پێك هێنانی دەوڵەتی سەربەخۆیی تاییەت بەخۆیان.

"لینین" لەو بڕوایەدا بوو کە (نەتەوە) بە شێوەیەکی سروشتی گەشە دەکات لەگەڵ راپەرینو سەرهەڵدانی چینی ناوراست دا.

"دەوڵەتی نەتەوەیی" کە سایەتی سیاسی سەردەمی سەرمایەداری سەرەرای ئەمانە جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە پێویستە یارمەتی "کۆمەڵە نەتەوەکان" بدرێتو پشتیان بگرێت لە تێکۆشانیدا بەوەی کە هۆکارێکی سەرەکین لە خەباتدا دژی ئیمپریالیزم. ئەمانە جوڵێنەری هێزی راستەقینەن وە پرۆلیتاری سۆشیالیستین وە بەم چەشنە لەسەر مارکسیەکان پێویستە لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا تەنها بە مافی چارەی خۆنوسین واز نەهێنن بەڵکو پێویستە یارمەتی لایەنە شۆڕشگێرەکان بدەن لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی بۆرجوازیەت لەو وڵاتانەداو هانیان بدرێت بۆ شۆڕش دژی ئیمپریالیزم.

سەبارەت بە ستالین..

مافی چارەی خۆنوسین لەلای ستالین تەنها رێگایە بۆ حزمەت کردنی بەرژەوەندییەکانی شۆڕشی جیهانی (الثورة العالمیة) ئەگەر هاتوو ئەم داواکرییە (مافی چارەی خۆنوسین) لەگەڵ بەرژەوەندی سۆشیالیستی جیهانیو شۆڕشی جیهانیدا نەگونجێت دەبێت ئەم داوا کارییە رەت بکرێتەوە.

بەرنامەی ستالین بۆ مافی چارەی خۆنوسین بریتییە لە

١. داننان بە مافی گەلان لە خەباتیاندا لە پێناوی (دیاری کردنی چارەنوسیاندا) ئەگەر هاتوو بۆ مەبەستی دژایەتی کردنی دەوڵەتی سەرمایەداری بێتو هەنگاوێك بێت بۆ خێرا کردن بۆ لەناوبردنی سەرمایەدارییو زیاد کردنی کەمو کورتییو درز کردنە ناو کۆمەڵگای سەرمایەدارییەوە..

٢.دەبێت یەك (هەیکەلی پرۆلیتاری)و یەك حزبی کرێکاری هەبێت کە نەتەوە جیاوازەکان بگرێتە خۆی لەناو یەك دەوڵەتدا.

٣.سەربەخۆیی خۆیی-الاستقلال الذاتي- بۆ گەلانی جیهانی سۆشیالیستی لەناو یەك دەوڵەتدا، کە یاساکان رێگە بدەن بە سەربەستی گەشەکردنی کەمە نەتەوەییەکان. هەرچەندە دەوڵەتی سۆڤیەت (پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین) وەك مافێکی ملزم دادەنێت کە رێگە دەدات بەجیابوونەوەو پێك هێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ. ئەمە هەر لە یەکەم ساتی دامەزراندنیەوە لە مێژووی ١٩١٧/١١/٢دا رای گەیاند..

١.یەکسانیو سەروەری بۆ هەموو گەلانی روسیا.

٢.مافی گەلانی روسیا لە دیاری کردنی چارەنوسیاندا. تادەگاتە رادەی جیابونەوەو پێك هێنانی دەوڵەتی سەربەخۆ.

٣.لەناو بردنی (ئیمتیارانی چینایەتیو چەوساندنەوەی نەتەوەیی).

٤.رێگە بە پێشکەوتنی سەربەستانەی کەمینە نەتەوییەکان بدرێت.

وهەر لە ئەنجامی ئەم راگەیاندنەدا بوو کە سەربەخۆیی هەندێ لە کۆمارەکانی سۆڤیەت راگەیەنرا وەك (جۆرجیا، فنلندا، ئەرمینیا، ئۆکرانیا، رووسیای سپی، ئستوانیا، لیتوانیاو ئازەربایجان). وە تەنانەت راگەیەندرا کە مافی چارەی خۆنوسین مافێکی ملزمەو رێگەنەدان بە گرتنە خۆی ئەو هەرێمانەی کە لە کاتی جەنگدا داگیر کراون، وە دەبێت سەربەخۆیی سیاسیان بۆ بگەرێتەوە کە سەربەخۆییان زەوت کرا بوو لە ئەنجامی جەنگدا.

ئەمەو ئەو پەیماننامانەی کە دەوڵەتی سۆڤیەت لەگەڵ هەریەکە لە ئستوانیا، لیتوانیا، پۆلەندا، ئێران، تورکیاو چیکۆسلۆفاکیادا بەستی. زیاتر جەخت لەسەر داننان بە مافی چارەی خۆنووسین دەکات.

**٤.سەردەمی سەرهەڵدانی مافی چارەی خۆنووسین:**

سەبارەت بەسەرهەڵدانی مافی چارەی خۆنوسین لە مێژوودا، بۆ چ سەردەمانێك دەگەڕێتەوە؟

ناتوانین بڵێین کە مافی چارەی خۆنووسین، لە سەردەمە کۆنەکاندا دانی پیادا نەنراوە، گەر بگەڕێینەوە بۆ مێژووی شارستانیەتی یۆنانیەکان لە شارەکانی یۆنانی کۆندا "ئەسپارتاو ئەسینا"دا دەبینرێت کە پرەنسیپی مافی چارەی خۆنوسین، بەکارهاتووە لە کارو باری رێکخستنی شارەکانیاندا، هەرچەندە کە ناکۆکیە بەردەوامیەکان لە نێوان حاکمەکان و خەڵکانی فەرمان رەواکەیان لە لایەکەوە، و خاوەن بەرژەوندیەکان و ئەوانەی کە چارەنوسیان بە دەست خۆیان نەبووە، لە لایەکیترەوە، ریشەی داکوتا بوو. بەڵام بەهۆی ئەو دیموکراتیەی لە شارەکانی یۆناندا کە باڵادەست بووە، (وەهەر شارەکانیش دەوڵەتی دەنواند)، لەبەر ئەوە رێگە بەو پرەنسیپە درا کە گەشە بکات بە رێگەیەکی یاسایی، لە رێگەی دەستوورو دام و دەزگا دیموکراتیەکانەوە.

هەروەها لە (رۆما)شدا پایتەختی ئەمپراتۆریەت،و شاری یاساو هێزو تواناادا، پێویست بوو لەسەر هاوولاتی ئەمپراتۆیەت ئەو هاوولاتیانەی کە لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردراون (البلیبون).(٥). کە مافی چارەی خۆنوسینی خۆیان لە ژێر چنگی گەورەکاندا بەدەست بهێنن، وە لە رێگەی یاساکانی رۆماوە دان بەو بنەمایەدا بنرێت..

لە چاخەکانی ناوەراستدا، سەبارەت بە دیاری کردنی مافی چارەی خۆنووسین "سۆلێر" باسی چەند حاڵەتێکی کردووە کە خەڵکی بەرپەرچی گۆرانکاریان دەکرد لە لایەنگرانیان بۆ گەورەیەك یان دەوڵەتێك، بەپێی ئارەزووی گەورەکان بەبێ گەرانەوە بۆ خواستەکانی گەل..

بەلام هەرچۆنێك بێت، مافی چارەی خۆنوسین، بەو شێوەیەی کە لە کۆندا باسی لێوە کراوەو تێی گەیشتوون رووداوەکانی دوای سەدەی شانزەیەم لە بیری بردنەوە، بەهۆی ناکۆکیە نێو دەوڵەتیەکان و شەڕی نێوان پاشاو شازادەکان و دوویەرەکیەکانیان، مافی گەلەکانیان ژێر پی دەخست. چاوچنۆکی فەرمانڕواکان گەیشتبووە رادەیەك، کە زەوی‌و زارو دانیشتووەکانیان بە ئارەزووی خۆیان لە پادشایەکەوە بۆ یەکێکی‌تر دەگوێزرایەو، لە جیاتی مارەیی ژن هێنان یان هەر وەك دیارییەك پێشکەش بە نەناسیاوێکیان دەکرد..

گەر بگەرێینەوە بۆ چۆنیەتی سەرهەڵدانەوەی مافی چارەی خۆنوسین وەك ئاماژەمان بۆ کردووە لەمەوپێش کە مافی چارەی خۆنووسی لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا زیاتر بەکار دەهێنرا، ئەمەش وەرگێرانی وشەی ئەڵمانی (Selbstimmonq Serecht) کە بەکار دەهێنرا لە مەسەلەی نەتەوەکاندا.

گلبرت مودی دەڵێت: ئەم وشەیە لە سەرەتادا لە کتێبی فەیلەسوفەکانی ئەڵمانی‌دا بەرچاو دەکەوت، لە ساڵانی ١٨٤٨و لە ساڵی ١٩١٥ ئەم وشەیە بەکارهێنرا بۆ دەربڕین لە وەرگێرانی یەکێك لە بڕیارەکانی کۆنگرەی سۆشیالیستەکا کە لە (کۆبنهاگن) بەسترا، ئەوەی شایانی باس بێت کە ئەم دەربڕینە بۆ یەکەم جار بە ئینگلیزی بوو کە داوای داننانی بە مافی چارەی خۆنوسیندا دەکرد..

بەلام لێرەدا بابەتێکی سەرەکی‌تر سەر هەڵدەدات ئەویش (رەگەزی نەتەوەیی)یە، کە هەندێك لە روناکبیرەکان بە هۆکارێکی سەرەکی دادەنێت لە مەسەلەی مافی چارەی خۆنووسین دا. کەسانی‌تر هەن کە جیاوازی ناکەن. لە نێوان مەسەلەی نەتەوەو مافی چارەی خۆنووسین دا، بەم جۆرە هەموو ئەو تاوانانەی کە ئاراستەی مەسەلەی نەتەوە دەکرێتەوە بە مەسەلەی مافی چارەی خۆنوسیندا دەبەسترێتەوە..(٦). بەلام راستی‌یەك هەیە کە پێویستە بوترێت، کە

هیچ بزوتنەوەیەکی رزگاری خوازی بەبێ رەگەزی نەتەوەیی بوونی نی‌یە، بەلاّم ئەوەیە کە دەبێت بزانرێت هەموو بزوتنەوەیەك باروذۆخێکی بابەتیانەی خۆی هەیە لەلایەنی ئابووری‌و سیاسی‌یەوە.

هەر چۆنێك بێت مافی چارەی خۆنوسین، هەتا ئەگەر بە توندی بەسترابێتەوە بە مەسەلەی نەتەوەوە، دەگەرێت بە دوای پاساو هێنانەوە مادییەکاندا، وەك مێژوو وزمان چونکە مافی چارەی خۆنوسین بەمانا گشتی‌یەکەی، روداوێکی ژیرانە دادەنرێت کە زیاتر بەلایەنە هۆشیارییە مەزهەبیەکاندا وەبیرو باوەڕی نەتەوەیی‌دا دایدەشکێنێتەوە، لەبەر ئەوە زۆربەی جار بانگهێشتەی یەکسانی دەکات، لە نێوان هەموو میللەتاندا..(٧)

کەواتە مافی چارەی خۆنووسین کردارێکی ژیرانەیە کە یەکسانی نێوان هەموو رەگەزەکان دابین دەکات. بەبێ گوێدان بە رەنگ‌وقورساییان، تەنها ئامانج رزگار بوونە لە هەموو داگیر کەرێکی ناوخۆیی‌و ی‌دەرەکی..

هەندێك هەن دەڵێن، مافی چارەی خۆنوسین بانگ هێشتی راست رەوانەیە، هەندێکی‌تر دەڵێن مافی چارەی خۆنوسین بانگ هێشتی چەپ رەوانەیە.

بەلاّم راستیەکەی دیاری کردنی جۆری ئەم پرەنسیپە بەپێ‌ی بارودۆخ‌و شوێن دەگۆرێت. وەدەبێت ئامانجەکانیان دیاری بکرێت.

## ٥.هەوڵدان لە پێناوی تێگەیشتن لە مافی چارەی خۆنوسین

زۆر هەوڵدرا بۆ تێگەیشتنی مافی چارەی خۆنوسین، هەندێك هەوڵیان دا كە لەلایەنە بابەتیەكانەوە پێناسەی گەلان بكەن، بە تایبەتی ئەو گەلانەی كە لە یەكەیەكی یەكگرتوو پێك هاتبوون، كە ئەمانە هەمیشە داوای مافی چارەی خۆنوسین دەكەن. هەرچەندە زۆرجار جیاوازی دەكرێت لە نێوان هەستی نەتەوەیی و بزوتنەوە (چارەنووسی)یەكان، كە ئەم دوو بانگ هێشتە كە هەندێ جار یەك دەگرن و هەندێ جاری‌تر یەك ناگرنەو. (رینان)وەزۆربەی لەو نوسەرانەی تریش كە وەك ئەو وابوون، هاتن پێناسەی وشەی (گەل) یان كرد كە دەڵێن: خواستی تاكە كەس لە بوونی گەل یان نەبوونی دیاری دەكات. كەواتە تاكە كەس چارەنووسی خۆی دیاری دەكات.

لەهەمان كاتیشدا دەربڕینە لە خواستی بۆ پێك هێنانی ئەو گەلە كەواتە دەتوانین بگەینە ئەو دەرئەنجامەی كە مافی چارەی خۆنوسین وەیان ویستی مافی چارەی خۆنووسین و تێگەیشتنی بۆچوونی گەل یان نەتەوە، پێك دێت دوای ئەوەی كە ویستی تاكە كەس و كۆمەڵەكان روون دەبێت لە دیاری كردنی چارەنوسیاندا.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ تێگەیشتنی (چەمكی گەل) كە لە سەدەكانی یەكەمدا (یەكەمی زاینی‌دا) بوونی هەبووە، لەلای لاتینیەكان ئەوەی دەگەیاند بەمانای دروست كەر دەهات، پاشان بۆ ماوەیەكی زۆر گرنگی دەدا بە پێكەوەبەستنی هاوولاتیان وەیان كۆمەڵێك لە خەڵك. كە ئەو شارە وەیان ئەو شوێنە دەنوێنێت..(٨)

سەر کردەکانی شۆڕشی فەرەنسا، خەڵکیان بەکار دەهێنا وەك دەوڵەتێك بۆ یەکگرتنیان، بەهۆی ئاراستە کردنێکی جێگیرو دیاری کراو.
بەو جۆرە چەمکی گەل بەرە بەرە زۆر مانای جیاوازی وەرگرت، وەبەم جۆرە لە هەردوو زمانی ئینگلیزیو فەرەنسیدا مانای گەل بەرامبەر مانای دانیشتوانی دەوڵەت دەهات، شتێکی دەگمەنیش نەبوو کە ئەو دەوڵەتە فرەنەتەوە بێت، وەمەسەلەی نەتەوەش لەلایان گەرانەوە بۆ نیشتمانی دەگەیاند..
بەم جۆرە تێگەیشتنەی "چەمکی گەل" خۆی گەیاندە زمانەکانی تریش وەك ئەڵمانیو رووسی بەڵام لە ماوەیەکی دواتردا. کە مانای یەکێتی کۆمەڵایەتیو مێژوویی دەگەیاند کە سەرمایەداری لەگەڵ خۆیدا هێنایە کایەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا بەرهەمی گەشەکردنی رەسەنی گەلێکی دیاری کراو یان گەلانی سەربەخۆ لە ماوەی چەند سەدەی رابردوودا بوو..(٩)

## ٥-٥ چەمکی نەتەوە لە روانگەی مارکسیزمەوە

دراسەی ورد بینانەی مێژووی کۆمەڵایەتیو هێزی بەرهەم هێنان وەپەیوەندیەکانی بەرهەم هێنان، وای لە مارکسیەکان کرد کە بڵێن.. گەل کۆمەڵێکی جێگیرە لەخەڵك کە پێشینەیەکی مێژوویی یان هەیە، هەڵقوڵاوە لە یەکێتی زمانو خاكو ژیانی ئابووریو تەنانەت مەزاجی دەروونی یەکگرتوو کە ئەمانەش دەربڕین لە (رۆشنبیری نەتەوەیی) دەکات.
چونکە گەل دیاردەیەکی مێژووییە. وەنەتەوەکان لە قۆناغێکی دیاری کراو لە قۆناغەکانی گەشەکردنی کۆمەڵایەتیدا دەرکەوتوون، لە ئەورووپا پرۆسەی دروست

بوونـی نەتـەوەکان هـاودەم بـوو لەگـەڵ پرۆسـەی گەشـەکردن و سـەرهەڵدانی پەیوەندییە سەرمایەدارەکان...(١٠)

بەڵام سەبارەت بەو گەلانـەی کـە شـوێنگەی داپڵۆسـین و چاوتێـبڕینی داگـیر کـەران بـون. نەتـەوەکانیان لـە مـاوەی رۆداچوونـی سـەرمایەدارو هـەندێکیتر لـە سـێبەری سۆشیالیستدا دروسـت بـوون.. بـەڵام ئـەو راسـتی‌یەی کـە هـەموومان دەیزانین نەتەوەکان بەهەر شێوەیەك بێت بە قۆناغەکانی پێك هاتەی کۆمەڵایـەتی‌دا تێپـەربوون کە بریتین لـە (عەشیرەت، هۆز، نەتـەوە). کەواتـە نەتـەوە بریتی‌یـە لـە کۆمەڵگایەك هەر لە مێژە دروست بووە. زمان و ناوچەیـەکی تایبـەت بەخۆی هەیـە، ئەمە جگە لە رۆشنبیری هاوبەش و پەیوەندییە ئابوورییەکان..*

کەواتە نەتـەوە کۆبونـەوەی سێ جۆر لـە پەیوەستەکان، وەپێکەوە بەسـترانی لایەنـە مادی‌یـەکان (ئـابووری، یـەکێتی خـاك) دەگرێتـەوە هـەروها لایـەنی دووەم زمانی نەتەوە. وەلایەنی سێ‌یەمیش لایەنی رۆحی‌یە.

مەسەلەی نەتەوە لە فەلسەفەی مارکسی‌دا بە تایبـەتی لـەلای لینین شـوێنێکی دیاری کراوی هەیـە، لینین مەسـەلەی نەتـەوە بەیـەکێك لـە مەسـەلە سـەرەکیەکان دادەنێت لە فەلسەفەی مارکسی‌دا. وەهەردووکیان یەك دەگرنەوە لە مافی گەلان لـە دیاری کردنی چارەنووسی خۆیاندا..(١١)

ئەم پرەنسیپە لە داهێنـانی مارکسیەت نـەبووە، هـەروەك چـۆن لینـین خـۆی ئامـاژەی بـۆ ئـەوە کـردووە لـە یـەکێك لـە نوسـینەکانیدا..(١٢). کـە دەڵێـت ئـەم داواکارییـە (مەبەسـتی لـە سەرپەرشـتی گەلانـە لـە دیـاری کردنـی مـافی چـارەی خۆنووسـین دا)لـە سـەدەکانی حەڤدەیـەمدا دارێـژراوە لەسـەر دەسـتی بـۆرژوا بچوکەکاندا کە دیموکراسی بوون، ئەو کاتە ئەم پرەنسیپە بە پرەنسیپی نەتەوەیی ناودەبرا. هەرچەندە ئەم پرەنسیپە زۆر کۆنـە، بـەڵام پرۆسـەی جێبـەجێ کردنـی بەخۆیەوە نەدیووە بە دەگمەن نەبێت..(١٣)

وە هەر لینین خۆی دەڵێت کە نەتەوە بەرهەمی حەتمیەتیو شێوازی حەتمیەتی سەردەمی بۆرژوایە لە گەشەکردنی کۆمەڵایەتیدا..(١٤)

پاوان کردنی نەتەوە بێ هێزو بێدەسەڵاتەکان لەلایەن نەتەوە بەهێزەکانەوە لە بواری سەربازیو ئابورییەوە، شتێکی سروشتییە چونکە ئەمەیە یاسای گەشەکردنی نەتەوە بۆرجوازییەکان. وەبەهۆی ئەم گەشە کردنە وە لەژێر سێبەری سەرمایەداریدا بە شێوەیەکی زۆر توند بەیەکەوە دەبەسترێتەوە بۆ گرێدانی تێکۆشانی نەتەوە چەوساوەکان بەیەکەوە لە پێناوی رزگاریو بەدەست هێنانی سەربەخۆییدا..(١٥)

لەگەڵ دەست پێکردنی قۆناغی ئەمپریالیزمدا (قۆناغی داگیرکردن) پەیوەندییە نەتەوەییەکان گۆرانکاری بەسەردا هات، بەجۆرێك لە مەسەلەیەکی ناوخۆییەوە گۆڕا بۆ مەسەلەیەکی دەرەکی، کە دەڵێین دەرەکی مەبەست لە بە جیهان کردنێتی، چونکە مەسەلەی (کەمە نەتەوەییەکان) لە سنوری دەوڵەتێکی دیاری کراودا نەمایەوە بەڵکو بوو بە مەسەلەیەکی نیشتمانی لە ناوچە داگیر کراوەکاندا کە پێش هەموو شتێك مەسەلەی تێکۆشانی نەتەوەیی دەگەیاند دژی کۆلۆنیالی، و لە پێناوی رزگاری،و گەشەکردنی بەردەوام بەرەو پێش کەوتن..(١٦)

مەسەلەی مافی گەلان لە دیاری کردنی چارەنوسدا بەرنامەی روسی کە لە ساڵی ١٩٠٣دا چارەسەری بۆ نەدۆزیەوە، بەڵکو چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە لەبڕیارەکانی (کۆنگرەی لەندەن)ی جیهانیدا کە لە ساڵی ١٨٩٦ بەسترا، بزوتنەوە نەتەوەییەکان بە تەنها لە رووسیادا بۆ یەکەم جار دەرئەکەوت، و تایبەت نەبووە بە تەنها ئەو وڵاتە، بەڵکو لە هەموو جیهاندا لە سەردەمی سەرکەوتنی سەرمایەداری بەسەر دەرەبەگایەتیدا کە هاوئاهەنگ بوو لەگەڵ بزوتنەوە نەتەوەییەکاندا بنەچەی ئەو بزوتنەوانە ئابووری بوون بەهۆی سەرکەوتن لە بواری بەرهەم هێناندا، وە دەسەڵاتی تەواوی بۆرجوازیەت بەسەر بازاڕەکانی ناوخۆدا، ویەکگرتنی ئەو

زەویانەی کە دانیشتوانەکانی بەیەك زمان قسە دەکەن چونکە زمان گرنگترین هۆکارە بۆ پەیوەندی کردنی خەڵکان بە یەکتری‌یەو، لە هەمان کاتدا یەکگرتووی زمان‌و سەربەستی بەرەو پێش چوون، مەرجی سەرەکین لە ئاڵ‌و گۆڕە بازرگانیەکانداو بۆ دروست کردنی پەیوندی بەهێز لە نێوان بازاڕو خاوەن کارە گەورەو بچوکەکانیشدا..(١٧)

مەبەستیش لەسەربەستی گەلان لە دیاری کردنی چارەنوسیاندا، واتە جیابوونەویان لە کۆمەڵانی نەتەوەیی بێگانە وە مەبەست لە دروست کردنی دەوڵەتی نەتەوەیی سەربەخۆیە وە ئەگەر سەیری دەوڵەتە نەتەوەییەکان بکەین لەرووی پەیوەندیەوە باشترین ڕێگایە بۆ گەشە کردنی سەرمایەداری.

لینین دەڵێت: مارکسیەکان ناتوانن هۆکارە ئابورییەکان پشتگوێ بخەن، کە ئەمە بەهێزترین هۆکارە بۆ دروست بوونی دەوڵەتە نەتەوەییەکان، کەواتە سەربەستی گەلان لە دیاری کردنی مافی چارەی خۆنووسین دا لە بەرنامەی مارکسیەکاندا لە رووی مێژوویی‌و ئابورییەوە تەنها یەك مانا دەگەیەنێ ئەویش سەربەستی دیاری کردنی چارەنووسی سیاسی‌یە واتە سەربەخۆ بوون وەك دەوڵەت بۆ نمونە لە رۆژئاوای ئەوروپادا سەردەمی شۆڕشە دیموکراسیەکان هەر لە سالآنی ١٧٨٩ هەتا وەکو ١٨٧١، ئالەم ماویەدا زیاتر بزوتنەوە نەتەوییەکان سەریان هەڵدا. پاشانیش دروست دروست بوونی دەوڵەت (دەوڵەتی بۆرجوازی بچوك) کە سیستەمێکی ڕێك‌و پێك‌و تەواویان هەبوو.

بەلآم لە رۆژهەلآتی ئەورووپاو ئاسیادا سەردەمی شۆڕشی دیموکراسی بۆرجوازی دەستی پێ نەکرد تەنها لە سالآنی دوای ١٩٠٥بووە وەك ئەو شۆڕشانەی کەلە روسیا، فارس‌و تورکیاو چین دا روویان دا..

هەروەها لینین لە شوێنێکی‌تردا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پێویستە دان بە مافی جیابونەوەدا بنرێت، وهەموو مەسەلەی میللەتێك بەپێی بارودۆخی خۆی هەڵبسەنگێنرێت.

سەبارەت بە پێکەوەلکانی ئەو زەویانەی دەخرانە سەر دەوڵەتانی‌تر بیرو بۆچوونی خۆی بەوە دەردەبڕێت کە دژی پێکەوە لکاندنە چونکە دەست درێژی کردنە بۆ سەر مافی میللەتان لە دیاری کردنی چارەنووسیاندا، هەروەها شێوەیەکە لە شێوەکانی چەوساندنەوەی نەتەوەیی. لەبەر ئەوە دەبێت بە هەموو شێوەیەك دژی سیستەمی کۆلۆنیالیزمی بوەستین. وداوای رزگار کردنی سەرتاسەری ناوچە کۆلۆنیالیکراوەکان بکرێت کە ئەمەش مەحاڵە بەبێ بوون‌و روودانی شۆڕش.

سەبارەت بە سیستەمی ئۆتۆنۆمی وەك چاك سازییەك بێ‌گومان جیاوازی هەیە لەگەڵ سەربەستی جیابوونەوە، وەك بەرنامەیەکی شۆڕشگێرانە. ئەمە هیچ کێشەیەك نی‌یە لەسەری، بەڵام ریفۆرمی چاکسازی وك هەمووومان دەیزانین هەندێ جار لە پیادە کردنی عەمەلیدا هەنگاوێکە بەرەو شۆڕش‌و ئۆتۆنۆمیش رێگە بەو گەلانە دەدات کە بەزەبری هێز رازی بوون لەناو سنوری دەوڵەتێکدا بمێنێتەوە بتوانن رێگەی گەشە کردن‌و پێشکەوتن لەناو ئەو دەوڵەتەدا بدۆزنەوەو ئەو گەلە دروست بێت لە ئەنجامی کۆکردنەوەی تواناکانی وە چۆنیەتی رێکخستنیان، بارودۆخێکی گونجاو هەڵبژێرێت بۆ راگەیاندنی سەربەخۆیی خۆی..(١٨)

رۆژنامەی (ناشا راپۆمشایا غازینا) لە ژمارەی (٣)کە باس لە دانانان بە مافی هەموو میللەتان لە دیاری کردنی چارەنوسیاندا لەلایەن (ف-کۆسۆفسکی)وە نوسرا بوو تیایدا دەڵێت.. ئەم مافە بە شێویەکی میکانیکی وەرگیراوە لە بڕیاری کۆنگرەی یەکەمی حزب لە ١٨٩٨کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا وەرگیراوە لە کۆنگرەی‌کانی سۆشیالیزمی جیهانیدا، وە ئەم مافە لە کۆنگگرەی ساڵی ١٩٠٣ دا قبوڵ کرا، بە هەمان مانا کەنێو نەتەوەیی سۆشیالیزمی پێی بەخشی کە بریتی‌یە

لـه دیـاری کردنـی مـافی چـاره نووسـی سیاسـی، وەمـافی چـارەی خۆنوسـین، نەتـەوەکان بەرەو سەربەخۆ بوونـی سیاسـی. وەمافی چارەنوسـی نەتـەویی واتـە مـافی بەدەست هێنـانی قەوارەیـەکی هەرێمایەتی بـە تەنـهاو سـەربەخۆ، ئەمـە لـە کـاتێکدا کـە دووره پـەرێز وبـێ لایـەن دەبێـت لـە مەسـەلەی زانینـی چۆنیـەتی رێکخستنی پەیوەندییەکان لە ناو داموو دەزگاکانی دەوڵـەتکی دیـاری کـراودا بـە تایبەتی بە نسبەت ئەو نەتەوانەی کە ناتوانن، یاخود نایانەوێت لە سنوری ئەو دەوڵەتە دەربچن.

لینین جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە دەڵێت: (هەرچۆنێك بێـت بـە پراکتیـك نەکردنی مافی گەلان لە دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسین لە ژێر سـێبەری رژێمـی سۆشیالیستی‌دا خیانـەت کـردن دژی سۆشیالیستی دەنوێنێت). هـەروەها مـارکس‌و ئەنگلس کە هـەردوکیان گـەورەترین نوێنـەری دیموکراسـی‌و مامۆسـتای پرۆلیتاریـا بـوون لـە سـەدەی نۆزدەهـەمدا، ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـەن ئـەو گەلـەی گەلێکی‌تر بچەوسێنێتەوە ناتوانرێت بوترێت گەلێکی سەربەستە..(١٩)

## ٦- پێك هێنانی مافی چارەی خۆنوسین

دەتوانـین بڵێـین کـە مـافی چـارەی خۆنوسـین لەسـەر سـێ‌رایەڵی سـەرەکی دەوەستێت کە بریتین لە:

٦-١ یەکەم: چەمکی دەوڵەتی تازە یان سەروەری لە رژێمـی دەوڵـەتی تـازەدا، ئەم چەمکە بۆ "چاخی راپـەڕین‌و سـەردەمی بزوتنـەو مرۆڤایەتیـەکان. دەگەڕێتـەوە کـاتێك کە مرۆڤ گەیشتە لێکۆڵینـەو زانستیەکان‌و دوور کەوتنـەوە لـە ئەفسـانەو داب‌و نەریتـە کۆنـەکان‌و گـەران بەشـوێن رێکخسـتنی کۆمـەڵ‌و تاکـە کـەس دا،

چۆنیەتی دروست بوونی دەوڵەت و لێکدانەوەی سێ ڕایەڵی سەرەکی دەوڵەت کە بریتی‌یە لە زەوی (خاك)، کۆمەڵانی خەڵك و سەروەری..

٦-٢دووەم: بیرو باوەڕی دیمکراسی و سەربەستی.. پادشاکان خاوەن دەسەڵاتی ڕەها بوون بە درێژایی چەندەها سەدە، تا سەدەی شازدەهەم و دواتریش بەردەوام بوو. کلێسا قەواڵەی خواوەندی خۆی رادەگەیاند بۆ پێ‌بەخشینی و پشتگیری کردنیان بەڵام ئەوە بوو لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا هەندێ لە فەیلەسوفەکان بە تایبەت (ڕۆسۆو هۆبزو لۆك) کە هەوڵیان دا لە ڕێکخستنی پەیوەندییەکان لە نێوان فەرمانڕەواو خەڵکانی فەرمانڕەواکە لەسەر بناعەی گرێ بەستی کۆمەڵایەتی‌دا بێت.

(ئەرستۆو ئەفلاتۆن) بە هەمان شێوە کە پێشتر باسیان لە دەوڵەت و دیموکراسیەت دەکرد، ئەرستۆ زیاتر جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە دەوڵەت بۆ ئەوەیە کە ژیانێکی باشتری تێدا ببرێتە سەر نەك هەر تەنها ژیان، برنادشۆ بڕوای وایە کە دیموکراسیەت بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگایە لەبەرژەوەندی هەموو مرۆڤێکدا بێت و بەبێ جیاوازی.

برنادشۆ دژی دیموکراسیەتی جەماوەر نەبووە، بەڵکو دژی خراپی بەکارهێنانی بووە کە دەبێت زۆر بەچاکی بەکار بهێنرێت لە مەیدانی زانست و رامیاری‌دا. دیموکراسیەت لە تێگەیشتنی ناوخۆیدا جیاوازی هەیە لەگەڵ تێگەیشتنە دەرەکیەکەی‌دا.

چونکە هەر کاتێك کە دیموکراسیەت هاتە دی هەتا ئەگەر بە شێویەکی ڕێژەیی بێت داوای دیاری کردنی مافی چارەنووسی تاکەکانی دەکات پاشان گەشە دەکات و داوای مافی کۆمەڵایەتی دەکات لە دیاری کردنی چارەنوسیاندا.

بەم جۆرە سەربەستی نیشتمانی لە حوکمی دیموکراسیدا رەنگ دانەوی هەیە، چاکترین رێگاش بۆ دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسین لە رێگەی پرۆسەی ریفراندۆم یان راپرسی خەڵکەوە دەبێت.

٦-٣سێیەم: سەروەری نیشتمانی: دەربڕینێکی تازەیە ، تازەگەرییەکەی بەستراوەتەوە بە دەوڵەتی تازەوە هەروها بە دیموکراسی کۆمەڵەوە، بەلام سەروەری بەمانا ناوخۆیی‌و دەرەکیەکەی دەربڕینێکی _سیاسی‌و یاسایی‌یە_. سەبارەت بە سەروەری مقۆمقۆیەکی توند لە نێوان رووناکبیراندا پەیدا بوون ئەوانەی کە زیاتر ئەم مەسەلەیان بەلاوە گرنگ بوو (ئادابی، لاوسکی، رینان‌و لوبستر) بوون. سەبارەت بە چارەنوسی گەلان‌و سەروەریان‌و بابەتی فەرمانڕەوایی، کە دەبێت خەڵکان خۆیان لە بواری ناوەوەو دەرەوشدا بڕیاری لەسەر بدەن، سەروەری بووە پێوانەیەکی یاسایی‌و رامیاری کە خۆی لە خۆیدا سەربەخۆیی دەگەیاندو کاری کردبووە سەر سەرکردە سیاسی‌یەکان لە لایەك، وەگەلانیش لە لایەکی ترەوە کە لە سەربەخۆیی بوون زیاتر بە هیچی‌تر رازی نەدەبوون، کەواتە سەروەری "سەربەخۆیی بوون" دەگرێتەوە سەربەخۆ بوونیش هەر خۆی سەروەرییەو هەردوکیان بەیەکەوە مافی چارەی خۆنووسین دیاری دەکەن..(٢٠)

مافی‌چارەی خۆنوسین لەچاخی نیشتمانی‌دا بەستراوەتەوە بە مافی میللەتان لە:

١.مانەوە.

٢.سەربەخۆییان.

٣.یەکسانیان.(٢١)

یاسا نێو دەوڵەتی‌یەکان کۆنەکان بە هەموو سەرچاوەکانیان هەر لە (عورف- رێکەوتنەکان-بنەما گشتی‌یەکان-بڕیارەکانی ناوبژیوان) شتێکی بێگومانە کە هەموویان لە ئەنجامی بەرژەوەندییە بالاکانی ولاتە زلهێزەکان هاتنە کایەوەو بۆ

جێبەجێ کردنی مەبەستەکانیان. بەڵام پاش ئەو گۆرانکاریانەی بەسەر باردودۆخی نێو دەوڵەتیدا هات، وای لە دەوڵەتە سۆشیالیستەکان و دەوڵەتە تازە سەربەخۆبووەکان کرد کە داوای گۆرانکاری بکەن لە بنەماکانی یاسا نێو دەوڵەتیەکاندا، چونکە سەردەمی ئێستا سەردەمی یەکسانی یاساییە لە نێوان دەوڵەتاندا. سەردەمی بوونی رێکخراوی وەك نەتەوە یەکگرتووەکان. کەواتە زۆر ئاساییە کە داواکاری یەکەمی زۆربەی دەوڵەتان بە پلەی یەکەم دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسین بەرز بۆوە، گەیشتە پلەی عورفی نێو دەوڵەتی.

سەبارەت بە رێکەوتن نامە نێو دەوڵەتیەکان پێش (پەیماننامەی ئاشتی) لە شەڕی جیهانی یەکەمدا جیاوازی هەیە لە دوای ئەم پەیماننامەیە. لەبەر ئەوەی پێش (پەیماننامەی ئاشتی) دەیان وت کە مافی چارەی خۆنوسین هیچ قەوارەیەکی نییە لە عورفی نێو دەوڵەتیدا.

بەڵام پاشان گۆرانکاری بەسەردا هات، زۆر هۆکارو پاڵپێوەنەر هەبوون، بەلام ئەم هۆکارانە یەکگرتوو نەبوون لە کەسایەتیە سیاسیەکانەوە دەگۆڕا بەپێی بوونی بەرژەوەندیەکانیان.

سەرۆکی ئەمریکی ولسون لە کۆمەڵەی گەلان دا ساڵی ۱۹۱۷دا دەڵێت: "من پێشنیار دەکەم هەموو گەل و نەتەوەیەك وازیان لێ بهێنرێت با خۆیان بریاری ئەو سیاسەتە بدەن کە دەبانەوێت، با بڕیاری پێشکەوتنی خۆیان بدەن بەبێ هیچ رێگرێك، با (گەل)ە بچوکەکانیش بە هەنگاوی یەکسان لەگەڵ دەوڵەتە بەهێزەکاندا کاروانی خۆیان ببڕن".

جەنراڵ (سمطس) یەکێك بوو لەو کەسانەی کە لە هەمان پەیماننامەدا رۆڵی سەرەکی هەبووە زیاتر جەختی لەسەر مافی چارەی خۆنوسین کردۆتەوە لە کۆمەڵەی گەلان دا لە کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۱۸دا، کە دەڵێت:

یەکێك لە بنەما سەرەکی‌یەکان ئەوەیە نابێت هیچ زەوییەك بلکێنرێت بە دەوڵەتە سەرکەوتووەکانەوە، دووەمیان دەبێت مافی چارەی خۆنووسین یان رازی بوونی خەڵکان بە جۆری ئەو حکومەتەی هەڵدەبژێرێن بە داد پەروری جێ‌بەجێ بکرێت.

هاوپەیمانەکان لەو کاتەدا یەك سەنگەریان نەبووە، لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا یەکیان گرتبوو دژی ئەڵمانیا، رووسەکان لە رێکەوتنامەی تەنهایان لەگەڵ ئەڵمانیادا لە "پرست لیبفۆزك" ساڵی ١٩١٧پێیان راگەیاند (مەبەستی سەرەکیان بەرقەرار بوونی ئاشتی‌یە لەسەر بناغەی مافی میللەتان لە دیاری کردنی مافی چارەی خۆنووسینی ئەو میللەتانەدا).

پاشان هاوپەیمانەکان پابەند بونی خۆیان راگەیاند بە پرنسیپی مافی چارەی خۆنوسینەوە، لە لایەکەوە بەریتانیا لەسەر زمانی سەرەك وەزیرانەوە (لوید جۆرج) خۆشحاڵی خۆیان راگەیاند. بەم پرەنسیپە کە دەڵێت: سێ پایەی سەرەکی هەیە بۆ ئاشتی هەمیشەیی، یەکێك لەوانە چارەسەر کردنی کێشەی زەوییەکانە لەسەر بناغەی مافی چارەی خۆنوسین. سەبارەت بە ئیتالیاو فەرەنسا (تحفظات) خۆگرتنەوەی خۆیان دەنوند بەهۆی کێشەی سنورەکانیان کە هەیان بووە، لەبەر ئەوە هەڵوێستی هاوپەیمانەکان ئاشکرا بوو هانی نەتەوەکانیان نەدەدا بۆ مافی چارەی خۆنوسین، بەڵکو تەنها داننان بەو مافەدا بوو، لە کاتێکدا کە نەتەوەکان دەیان سەپاند بەسەریاندا ئەمانەیش ناچار دەبوون چونکە بەرژەوەندییەکان وای دەویست، لە لایەکی‌ترەوە لە پێناوی پروپاگەندە کردن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان.

یەکێك لەو ئامانجە سەرەکیانەی کە بەرجەستە کرا، لەدەست دەرهێنانی زۆربەی زۆری ئەو زەوییانە بوو کە ئەڵمانیاو دەوڵەتانی‌تری (محور-تەوەر)دا لە ژێر دەستیاندا بوون.

ئەوە بوو کۆنگرەی ئاشتی لە ساڵی ١٩١٩ دوای شەڕی جیهانی یەکەم بەسترا، بە جۆرێك مافی چارەی خۆنوسین وەك کلیلی ئەفسوناوی لێ هاتبوو بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکیەکانی دەوڵەتە زلهێزەکان وەك چارەسەرێکی مرۆیی‌و سیاسی لە دواکاری دەوڵەتە بچوکەکاندا.

زۆربەی زۆری پەیماننامەکانی (پەیماننامەی رێکەوتن) مافی چارەی خۆنووسینی گرتبووە خۆ، بەزۆر شێوەی جیاواز گرنگترین پەیماننامە (پەیمانامەی ڤێرسای)ی بوو کە لەگەڵ ئەڵمانیادا بەسترا، بە پێی ئەو پەیماننامەیە ئەڵمانیا، لێ خۆش بوونی بۆ بەلجیکا راگەیاند لە هەموو مافەکانی لە زەوییەکانی (کرین‌و مالد)ی دا کە مادەی (٣٤)ئاماژەی بۆ دەکرد. کە دەڵێت:

لەماوەی شەش مانگدا دەست دەکرێت بە تۆمار کردنی هەموو هاووڵاتیانی ئەو ناوچانە بە مەبەستی دیاری کردنی ئارەزووەکانیان، ئاخۆ دەیانەوێ لە ژێر سەروەری ئەڵمانیادا بمێنێتەو یان نا.

بەهەمان شێوە بۆ ناوچەکانی (سیلیزیا سەرەوە)وە (بروسیا) بڕیار درا کە لە رێگەی دەنگ دانەوە رێز لە ئارەزووی خەڵکان وەربگرێت بۆ دیاری کردنی چارەنووسیان.

هەروەها هاوپەیمانەکان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیاو یابان بەیاننامەیەکیان دەکرد لە (٢٧ی ئەیلولی ١٩١٨) کە باس لە مافی چارەی خۆنوسین دەکات بۆ (دۆقیە دتشی)و ناوچەکانی (ئاورافاو ئەسیزا) لە رێگای دەربڕینی ئارەزووی دانیشتوانی ناوچەکە. وەزۆر کێشەی تریش چارەسەر کران کە دەرئەنجامەکەی بەرەو بڕیار دان دەچوون لەسەر دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسین، کە زۆربەی مادەکانی ئەو رێکەوتننامانە جێبەجێ کران (هەر وەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد چونکە بەرژەوەندییەکانیان وای

دەویست). لەبەر ئەوە هەر خۆیان دەستیان بە پیلان گێران کرد دژی ئەم پرەنسیپە لەژێر ناوی مافی چارەی خۆنوسیندا.

بۆ نمونە وتیان نابێت بەسەر زەوی دەوڵەتی (پۆڵندا-صربیا) جێبەجێ بکرێت. یان ئەو رێکەوتنامە نهێنیانەی لە نێوان هەردوو دەوڵەتی (فەرنساو بەریتانیا)دا رووی‌دا بۆ دابەشکردنی سەرو سامانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە خۆرهەڵاتی ناوەراستدا، یەکەم قوربانی بەرژەوەندی دەوڵەتە زلهێزەکان "گەلی کورد بوو" کە ویستو ئارەزووی پێشێل کرا لە پێناوی بەرژەوندی زلهێزەکاندا "کە پاشان بە وردی دێینە سەر باسکردنی"

ئەوەی راست بێت هەردوو دەوڵەتی هاوپەیمان بە تایبەتی بەریتانیاو فەرەنسا، پەیرەوی دوو پرەنسیپیان دەکرد ئەویش:

١.لایەنی سەرکەوتوو مافی ئەوەی هەیە مەرجەکانی خۆی بسەپێنێتو دەسکەوتی جەنگی هەبێت.

٢.جێبەجێ کردنی بنەمای مافی چارەی خۆنووسین تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت ئەگەر هاتوو دژی بەرژەوەندییە ستراتیجیو ئابووریو رامیاری‌یەکانیان بێت.

## ٧مافی چارەی خۆنوسین لەسەردەمی کۆمەڵەی گەلاندا

هەرچەندە لەسەردەمی (عهد عصبە الامم-کۆمەڵەی گەلاندا) دەقی روونو ئاشکرا بۆ پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین بەدی ناکرێت، بەڵام بوونی چەند

بنەماو پرەنسیپێکی تازەی تێدایە کە لە تێگەیشتنیدا مەبەستی لە گرتنە خۆی ئەم پرەنسیپی‌یە بۆ نمونە:

١.لەسەردەمی کۆمەڵەی گەلاندا سەر زەنیشتی (فتح) کراو بۆ دواتر تەحریم کرا، چونکە ئەم دیاردەیە لەگەڵ مافی گەلان‌و سەروەریاندا ناگونجێت، هەر لەبەر ئەم مەبەستە (سیستەمی پاراستنی کەمینەکان) دامەزرا. کە دەڵێت: پێویستە یەکسانی لە ماف‌و ئازادییەکاندا هەبێت بە شێوەیەکی (راستەقینەو فعلی) لە نێوان (کەمینەو زۆرینەدا) لەیەك دەوڵەتدا.

٢.دامەزراندنی (سیستەمی سەرپەرشتی-نظام الانتداب) کە بە هۆیەوە هەندێ لە دەوڵەتان دەخرانە ژێر چاودێری‌و سەرپەرشتی کۆمەڵەی گەلانەوە بە مەبەستی گەشە پێکردنی ئەو هەرێمانەی سەربەخۆ نین وە مەرام لەم یارمەتی‌دانەیان ئەوەیە تا بتوانن لە ئاستی گەورەترین لێپرسراوێتی دابن لە دوا رۆژدا ئەویش (لێپرسراوێتی) سەربەخۆییە، دەبێت بە هەموو شێوەیەك یارمەتیان بدرێت.

(کۆمەڵەی گەلان) پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسینی لە زۆر حاڵەتدا پراکتیك کردووە لەوانەش.

١.لەسەردەمی کۆمەڵەی گەلاندا بوو کە پۆڵەنداو تشکۆسلۆفاکیاو نەمساو مەجەرو ئیرلەندە سەربەخۆییان بەدەست هێنا.

٢.گەرانەوەی ئەلزاس‌و لۆرین بۆ فەرەنسا.

٣.گەرانەوەی شیلزویج بۆ دانیمارك‌و تراسلفانیاو بۆکونیا بۆ رۆمانیا.

٤.ژمارەیەکی زۆریش لە راپرس کرا.لەوانەش:

أ-راپرسی بۆ دیاری کردنی سنور لە نێوان (پۆڵەنداو ئەڵمانیا)لە لایەکەوە وەلە نێوان (فەرەنساو ئەڵمانیا) لەلایەکی‌ترەوە.

ب-راپرسی ساڵی ١٩٢٠له (کلاجنفورت) سەبارەت بەوەی ئایا بگەڕێتەوە بۆ نەمسا وەیان یوگسلافیا.

ج-راپرسی ساڵی ١٩٢٠ له (ئەلنشتاین و مارینۆ) سەبارەت بە گەرانەوەی بۆ پۆلەندا یان ئەڵەمانیا.

د-راپرسی ساڵی ١٩٢١کرا له (سۆبۆن) سەبارەت بە گەرانەوی یان بۆ مەجەر یان بۆ نەمسا.

هـ-راپرسی ساڵی ١٩٢١له سیلیزیای سەروو سەبارەت بە گەرانەوەیان بۆ پۆلەندا یان ئەڵمانیا.

و-راپرسی ساڵی ١٩٣٥ له ساردا کرا سەبارەت بە گەرانەویان بۆ فەرەنسا یان ئەڵمانیا وەیان هەروەك خۆی بهێڵرێتەوە.

*وەلە هەندێ حاڵەتدا (کۆمەڵەی گەلان) پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسینی رەت کردەوە کە پراکتیك بکرێت وەك:

أ-رەت کردنەوەی کۆمەڵە لە پراکتیك کردنی پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین سەبارەت بە گەرانەوەی نەمسا بۆ ئەڵمانیاو وە دژی گەرانەوەی "تیرۆلی ئەڵەمانی" وەستا بۆ ئەڵمانیا، بەڵکو (گرتنە خۆی بۆ ئیتالیا) لە ترسی ئەوەی گەرانەوەی ئەو شوێنانە بۆ ئەڵمانیا گیان و هەستی نەتەوایەتی ئەڵمانی دەبوژێتەوە تیایاندا.

ب-رەت کردنەوەی پراکتیك کردنی (مافی چارەی خۆنووسین) لە هەندێ دەوڵەتدا بەهۆی "بڕوا نەهێنانی کۆمەڵە بە ئەهلیەتی ئەو دەوڵەتانە" کە لە ئاست سەربەخۆبوندا بن لەبەر ئەوە رەتی داوای هەریەکە لە (عێراق، میسر، قلبین، ئیرلەندە)ی کرد بۆ سەربەخۆ بوون.

## ٨-هەڵسەنگاندنی یاسایی
## بۆ مافی چارەی خۆنووسین پێش بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان

سوور بوون لەسەر پێداویستی بە پراکتیك کردنی (مافی چارەی خۆنووسین) هۆی سەرەکی هەبوو:

١.راگەیاندنی هاوپەیمانەکان "شەڕی جیهانی یەکەم" دژی ئەڵمانیاو هێزەکانی تەوەر".

٢.لە دوای شەڕی جیهانی یەکەم پشت بەم پرەنسیپە بەسترا بە تایبەتی لە پەیماننامەی ئاشتیدا کە بە (فعلی) پراکتیك دەکرا لە زۆر حاڵەتدا.

٣.زۆربەی زۆری دەوڵەتان لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیدا، لەو کاتەدا رازی بوون بە پراکتیك کردنی (مافی چارەیخۆنووسین) ئەمەش بە روونی لە لێدوان و بیرخەرەوە رەسمیەکانی ئەو وڵاتانەدا بە دیار دەکەوێت.

کەواتە ئەمانە هەموویان دەمان گەیەنێتە ئەو ئامانجەی کە هەموو ئەو پراکتیك کردنانەی ئەم پرەنسیپە ببووە هۆی دامەزراندنی رێسای عورفی نێو دەوڵەتی.

وەئەگەر (کۆمەڵەیگەلان) هەندێك لە پراکتیك کردنەکانی مافی چارەی خۆنووسینی رەت کردبێتەوە، جۆرێك لە (تحفظات) پیشان دابێت ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ (هۆکاری)ی سیاسی. وە دەتوانین بڵێین یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکان پەیوەندی بە لاوازی (رێکخراوەی نێو دەوڵەتیەوە) هەیە وەمەبەستمان کۆمەڵەی گەلانە. سەرەرای ئەوەی کە پسپۆریەتیەکی فراوانی هەبووە بەڵام رێکخستنێکی کاریگەری نەبووە، کەواتە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە پەیوەندی بە "بەهانەی یاسایی ئەم پرەنسیپەوە نەبوە".

## ٩-مافی چارەی خۆنووسین لەبەر رۆشنایی بەڵێننامەی (UN)

بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ئاشکراو رونی، لە دەقەکانیدا ئاماژەی بۆ پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین کردووە، وای دادەنێت کە یەکێکە لە پرەنسیپو مەرامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان.

بەڵام ئەوەی لێرەدا سەرنجمان رادەکێشێت پەیدا بوونی گومانە سەبارەت بە بەهای یاسایی ئەم پرەنسیپەو چۆنیەتی لە پراکتیك کردنی. ئەگەر بمانەوێت لە بوونی ئەم پرەنسیپە بکۆڵینەوە چەند پرسیارێك دێتە رێمان..

١.ئایا ئەم پرەنسیپە چی دەگەیەنێت وەبە چ مانایەك دێت؟ بە مانای ئۆتۆنۆمی دێت یان بە مانای سەربەخۆییو پێك هێنانی دەوڵەت دێت، وەیان بە مانای جیابوونەوەو گرتنە خۆی لە لایەن دەوڵەتێکیترەوە دێت.

٢.ئایا مەبەست لەم پرەنسیپە (واتە مافی چارەی خۆنووسین) تەنها سەربەخۆیی سیاسی، وەیان سەربەخۆیی ئابووری دەگرێتەوە؟

٣.ئایا مەبەست لەم پرەنسیپە (مافێکی دەستوری‌یە) بۆ گەلان لە هەڵبژاردنی سیستەمی فەرمانڕەوایی کە لە سایەیدا دەژی، یان مەبەست لە (هەڵبژاردەی گەلان)ە لە بارودۆخی نێو دەوڵەتی باری گونجاوی خۆی دیاری بکات بەبێ دەست تێوەردانی لایەنێکی بێگانە؟

٤.سەبارەت بە بەها یاساییەکەی (القیمە القانونیە) ئایا پرەنسیپە ویان مافە ئەگەر پرەنسیپ بێت پرەنسیپێکی سیاسی‌یە، وەیان یاساییە کە بتوانرێت ئەرك‌و مافە یاساییەکانی لەسەر گەلاڵە بکرێت، وەئەگەر ماف بێت ئایا سروشت‌و جۆری ئەو ئەرکانەی لەسەر ئەستۆی دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان گەلاڵە

دەبێت. دەبێت چۆن بێت، بەرامبەر بە داوا كارییەكانی كۆمەڵانی نەتەوەیی كە لە ژێردەستیانداندو داوای دیاری كردنی مافی چارەی خۆنوسینی خۆیان دەكەن.

٥.سەبارەت بەوانەی كە داوای مافی چارەی خۆنووسین دەكەن دەبێت بە یەكێ رەوا ببینرێت، ئایا گەل داوای ئەم مافە دەكات وەیان كەمینە نەتەوییەكان وەیان تەنها زۆرینە لەناو یەك دەوڵەتدا بۆیان دەبێت ئەم داوایە بكەن؟

٦.وەئایا هەموو كۆمەڵێكی نەتەوەیی مافی داواكاری دیاری كردنی چارەنوسیان هەیە، وەیان ئەم مافە تایبەتە بە هەندێك لە كۆمەڵانی نەتەوەیی؟

٧.ئایا ئەو پێوەرانە دەبێت چی بن كە كۆمەڵانی نەتەوەیی پێ جیا دەكرێتەو لەوانی‌تر؟

٨.وە ئایا (دەسەڵاتی تایبەت) كێیە لە كۆمەڵگای نێو دەوڵەتی‌دا كە مافی بڕیاردانی ئەم پرەنسیپەی هەیە؟

٩.كەی‌و چۆن دەتوانرێت داوای ئەم مافە بكرێت، كەی گەلان دەتوانن داوای مافی چارەی خۆنووسینی خۆیان بكەن، لە چ بارودۆخێكدا وەدەبێت شێوازی بەكارهێنانی چۆن بێت؟

١٠.ئایا بە پراكتیك كردنی تایبەتە بە كۆمەڵانی نەتەوەیی وەیان دەوڵەتانی سەربەخۆش دەگرێتەوە كە دووچاری هەرەشەو فشاری لایەنی دەرەكی دەبنەوە؟

جا بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارانە دەبێت دراسەی پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین بكرێت لە سێبەری بەڵێننامەی نەتەوە یەكگرتووەكاندا وەلەژێر رۆشنایی ئەو رژێمە یاساییانەی كە ئەم پرەنسیپە هێناویەتیە كایەوە.

## ٩-١ بەڵێننامەی
## نەتەوە یەکگرتووەکان و مافی چارەی خۆنوسین

مادەی یەکەم: لە مەرام و پرەنسیپەکانی ئەم دەستەیەدا دەڵێت: گەشە پێدانی پەیوندی دۆستایەتی نێوان میللەتان، دەبێت لەسەر بناغەی رێز گرتن لەو پرەنسیپانە بێت کە داوای یەکسانی تەواو لە نێوان (گەلاندا) دەکات، کە هەریەکەیان مافی دیاری کردنی چارەنووسی خۆیان هەبێت.

مادەی (٥٥): لە هاوکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی‌دا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئارەزووی ئامادەکاری پێداویستی جێگیر بوون و خۆش گوزەرانی، بۆ پێك هێنانی پەیوەندی دۆستانەو راستگۆیانە، لەسەر بناغەی رێزگرتن لەو پرەنسیپانەی داوای یەکسانی لەمافەکاندا دەکات، لە نێوان گەلاندا بەوەی هەریەکەیان مافی دیاری کردنی چارەنووسی خۆیان هەبێت.

## ٩-٢ ر ێسای گشتی نێو دەوڵەتی چۆن دەڕوانێتە مافی چارەی خۆنووسین؟

مەبەست لە مافی چارەی خۆنوسین، واتە مافی گەلان لە سەربەستی هەڵبژاردنی جۆری حکومەتی تایبەت بە خۆیان وە شێوازی حوکم کردن، لەسەر ئەم بناغەیە دەتوانین بڵێین کە مافی چارەی خۆنووسین دوو رووی هەیە:

١.رووی ناوەوەی.. مافی گەل دەگرێتەوە لە پێك هێنانی سیستەمی فەرمانڕەوایی کە گونجاوبێت بۆیان و جێگیر کردنی فەرمانڕەواو گۆران پێکردنیان هەرکاتێك ویستیان.

٢.رووی دەرەوە.. مـافی گـەل دەگرێتـەوە لـە هـەڵبژاردنی بـارودۆخی نێـو دەوڵەتی خۆی چۆنیان بوێت، یان بە جیابوونەوەی لە دەوڵەتێکی دیاری کراو یان بە سەربەخۆ بوونیان وەیان بەیەك بونیان لەگەڵ دەوڵەتێکی تردا.

لیژنـەی مافی مـرۆڤ لـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان لەسـەر خواستی کۆمەڵـەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پێناسەی مافی چارەی خۆنووسین دەڵێت: هەموو گەل‌و نەتەوەیەك مافی چارەی خۆنووسینی هەیە وەبەپێی ئەم پرەنسیپە ماف دەداتـە هەموو گـەل‌و نەتەوەیـەك لـە گەشەپێدانی بارودۆخی سیاسی‌و ئـابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری...هتد

هەرچەندە رەخنـە لـەم پێناسـەیە گیرا، بـەوەی کـە هـەردوو دەربڕینـی (گـەل‌و نەتـەوە)ی بـەکاری هێنـاوە بەیەکەوە ئەمـە سـەرەرای ئـەوەی کـە وا دەگـەیەنێت کـە مافێکی کاتی بێت‌و دەتوانرێت پابەند نەبن پێوی.

بـەڵام لیژنـەی سـێیەم بۆ جاری دووەم پێناسـەیەکی تـری بـۆ مـافی چـارەی خۆنووسین کرد کـە کۆمەڵـەی گشـتی نەتـەوە یـەکگرتووەکانیش دانـی پیـادا نـا بەپێی بڕیاری ١٥١٤ لە (١٩٦٠/١٢/١٤)دا کە دەڵێت:

مـافی چـارەی خۆنووسـین مافێکـە هـەموو گـەلێك مـافی دیـاری کردنـی چارەنووسیان هەیە، وەبە هێزی ئەم مافە بۆیـان هەیـە سەربەستانە باری سیاسی خۆیان‌و گەشەپێدانی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و رۆشنبیری‌یان...هتدیاری بکەن.

## ٩-٣ بۆ کێیە مافی چارەی خۆنووسین؟

ئایا زۆرینـە یان کەمینـە مـافی دیـاری کردنـی چارەنوسـیان هەیـە بـە پـێی پێناسـەی نەتـەوە یـەکگرتووەکان هـەموو گـەلێك مافی دیاری کردنی چارەنووسـی هەیە، کەواتە هەموو گەلێك کۆمەڵە نەتەوەکانیش دەگرێتەوە لەناو میللەتێکدا کە

ئەم مافەیان هەبێت. کەواتە هەموو گەلێك دەگرێتەوە بەبی جیاوازی لە رەگەزو زمان و ئایین...هتد. وە مەبەست لە هەموو گەلێك ئەو گەلانەیە کە لە ژێر دەسەلاٌت و سەروەری دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەککگرتوەکان دان.

هەروەها ئەو گەلانەش دەگرێتەوە، کە بێبەش کراون لە هەموو دەسەلاٌت و سەروەرییەك لە هەرێمەکەیاندا.. ئەمە جگە لەوەی "کۆمەڵەی نەتەوەییەکان" دەگرێتەوە لەوانەیە باشترین دیاری کردن بۆ چەمکی گەل ئەمانە بگرێتەوە.

١.ئەوانەی کە بەشێك لە دەوڵەتێکی سەربەخۆیی خاوەن سەروەری پێك دەهێنن.

٢.ئەوانەی کە پێشتر لە ژێر دەسەلاٌتی دەوڵەتێکدا بوون وەئێستا ئەو دەوڵەتە بوونی نی یە.

٣.ئەوانەی کە ئێستا لە ژێر دەسەلاٌتی رژێمی دیکتاتۆریدان.

٤.ئەوانەی بەشێك لە دەوڵەتێکی سەربەخۆ پێك دەهێنن بەلاٌم جیابونەوەیان بەلاوە باشترەو دەیانەوێت کە دەوڵەتی سەربەخۆیی تایبەت بە خۆیان پێك بهێنن.

٥.ئەوانەی بەناو لە دەوڵەتێکی سەربەخۆدا دەژین بەلاٌم لە راستی‌دا لە ژێر دەسەلاٌتێکی تردان.

٦.ئەوانەی لەو هەرێمانەدا دەژین کە خاوەن ئۆتۆنۆمی نین.

وەمەرج نی یە ژمارەی ئەو گەلە دیاری کراو بێت (ئایا کەمن یان زۆرن) تا بتوانن داوای مافی چارەی خۆنوسینی خۆیان بکەن، گرنگ ژمارە نی یە گرنگ ئەوەیە توانای ئەوەیان هەبێت بتوانن پارێزگاری لە قەوارەیەکی یەککگرتووی سەربەخۆیی خۆیان بکەن جیاواز لە یەکەکانی‌تر لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی‌دا. چونکە مافی چارەی خۆنووسین وەك پرەنسیپێکی یاسایی. هێز لە بوونی تاکەکانەوە بەدەست دەهێنێت، کە بە کۆبونەوەیان کۆمەڵگایەکی جیاواز لە کۆمەڵگاکانی تر پێك دەهێنن لەبەر ئەوە شێوازی بەکارهێنانی ئەم مافە (جا ئەگەر

به ڕێگەیەکی ئاشتیانە بێت وەك ڕاپرسی وەیان بە ڕێگەیەکی ئاشتیانە بێت وەك شۆڕشی چەکداری). بەهەر شێوەك بێت گرنگ ئەوەیە کە ئامانج لە داننان بە مافی چارەی خۆنووسین ڕێگە گرتنە لە چەوسانەوەی گەلان‌و سەپاندنی بارێکی نائاسایی بەسەریاندا کە پێ‌ی ڕازی نابن چونکە دژی دادوەری‌و مەنتقی یاسایی‌یە.

## ٩-٤ ئەو دەسەڵاتەی دان دەنێت بەمافی چارەی خۆنوسین دا.

بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە هەردوو مادەکانی (١٠، ١١)دا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە "کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان" دەسەڵاتی چاو پیاخشانەوەو گفتوگۆکردنی هەیە لەسەر هەر مەسەلەیەك وەیان کارێك کە دەکەوێتە بواری بەڵێننامە، وە بۆی هەیە "واتە کۆمەڵەی گشتی نەتەو یەکگرتووەکان" ڕاسپاردە بدات بە دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان وەیان بە ئەنجومەنی ئاسایش وەیان بە هەردووکیان سەبارەت بەو مەسەلانەی کە پەیوەندی دارە بە مافی چارەی خۆنووسینەوە.

ئەنجومەنی ئاسایش سەیری ئەو مەسەلانە دەکات کە پەیوەندی بە مافی چارەی خۆنوسینەوە هەیە بە تایبەتی ئەگەر ببێتە هۆی دروست بوونی بەر بەرەکانی و تەنگژەیەکی نێو دەوڵەتی ئەگەر بەردەوام بێت ئەوا ئاشتی‌و ئاسایشی نێو دەوڵەتی دەکەوێتە مەترسیەوە، لەبەر ئەوە دەبێت هەموو ڕێگایەکی یەکالاکردنەو بگرێتە بەر وە ڕێ‌و شوێنی پێویست وەربگرێت لە پێناوی پاراستنی ئاشتی‌و ئاسایشی نێو دەوڵەتی.

**٩-٥ مافی چارەی خۆنووسین و پابەند بوون بەم پرەنسیپە:**

هەندێ لە یاسا ناسەکان دەڵێن: لەبەر ئەوەی (میثاق)بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە ئاماژەی بۆ مافی چارەی خۆنووسین کردووە وەك پرەنسیپێك وە وای دانەناوە وەك مافێك بێت کە دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان پێوەی پەیوەست بن، لەبەر ئەوە مافی چارەی خۆنووسین وەك پرەنسیپێکی پابەند نەبوو دادەنرێت چونکە سیفەتی پابەند بوون تایبەتە بە ماف بە تەنها. بەڵام هەندێکیتر لە یاسا ناسان وای بۆ دەچن کە مافی چارەی خۆنووسین گرنگ نییە چ ناوێکی بۆ هەڵدەبژێرێت، ئایا پێی دەوترێت پرەنسیپ یان ماف، گرنگ ئەوەیە نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەڵێننامەدا ئاماژەی بۆ دەکات کە لە مەرام و پرەنسیپەکانی خۆی دادەنێت و دەوڵەتانی ئەندام پەیوەست دەکات لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیاندا بە نیاز پاکی، وەتەنانەت (مادەی -٧-) ڕێگەدەدات بە دەرکردنی هەر دەوڵەتێکی ئەندام کە بنەماکانی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشێل دەکات.

مادەی (٢٤برگەی ٢) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەنجومەنی ئاسایش، ئەرکەکانی خۆی ئەنجام دەدات لە پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی، بەو شێوەیەی کە بەڵێننامە دیاری دەکات، ئەمانە هەموویان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە مافی چارەی خۆنووسین وەك پرەنسیپێك، هیچ کاریگەرییەکی نییە لەسەر (بەها یاساییەکەی) کە دەبێت دەوڵەتانی ئەندام پێوەی پابەند بن، چونکە بەڵێننامە خۆی هەردوو زاراوەی (پرەنسیپ و ماف)ی بەکار هێناوە بە شێوەیەکی هاوبەشی کە مەبەست لێ ی هەمان مانایە.

لەبەر ئەوە بەکارهێنانی وشەی ماف وا دادەنرێت کە دەوڵەتان ئارەزوو دەکەن سیفەتی مافی مرۆیی بۆ مافی چارەی خۆنووسین زیاد بکەن وە دەتوانین بۆ ئەم بۆ

چوونە پشتگیری لە بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان تێبینی بکرێت بە تایبەتی بڕیاری ژمارە (٦٣٧)کە لە ١٩٥٣/١٢/١٦دا دەری کرد کە دەڵێن مافی گەل‌و نەتەوەکان لە دیاری کردنی چارەنوسیاندا،

## ٩-٦ بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەو یەکگرتووەکان سەبارەت بە مافی چارەی خۆنووسین

١.یەکێك لە هەرە گرنگترین بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان ڕاگەیاندنی پێبەخشینی سەربەخۆیی بۆ گەل‌و ناوچە کۆلۆنیاڵکراوەکان بوو لە بڕیاری ژمارە (١٥١٤) لە دەورەی (١٥)دا لە ١٩٦٠/١٢/١٤دا دەری کرد، کە ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە سەردانەواندنی بۆ دەسەلاتی بێگانە ریگە دەدات بە بوونی هەموو شێوازێکی داپڵۆسین دژی ئەو گەلانە بەکار بهێنرێت، لەبەر ئەوە پێویستە سنورێك بۆ هەموو کارێکی چەکدارانە دابنرێت دژی گەلانی ناوچە داگیر کراوەکان، کە پێشێل کردنێکی ئاشکرایە لە مافەکانی مرۆڤ‌و دژی بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانە، وە ڕێگرێك دەبێت لەبەردەم ئاشتی‌و ئاسایشی نێو دەوڵەتی‌دا.

لەبەر ئەوە پێویستە (بەخۆکەوتنی) خێرا بکرێت لەو هەرێمانەی کە سیستەمی پێسپێری دەیان گرێتەوە وەیان ئەو هەرێمانەی ئۆتۆنۆمیان نی‌یە وە هەموو ئەو هەرێمانەی کە سەربەخۆییان بە دەست نەهێناوە.

گرنگی بڕیاری (١٥١٤)ی ساڵی ١٩٦٠ لەوەدا بوو کە لە شێوەی جاردانێکی جیهانی‌دا دەرچوو، نەك تەنها لە شێوازی داڕشتنی بڕیارەکەدا. بەڵکو لە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی زۆربەی زۆری دەوڵەتانی ئەندام، بەکۆی (٨٩)دەوڵەت دژی هیچ، وەدەنگ نەدانی (٩)دەوڵەت.

٢.بڕیـاری ژمـاره (٢١٣١)ی كۆمەڵـەی گشـتی نەتـەوە یـەكگرتوەكان لـە ١٩٦٥/١٢/٢١دا دەرچوو كە جەخت لەسەر داننان بە مافی چارەی خۆنووسیندا دەكات كە دەڵێت: "ئەو مافە بناغەی سەربەستیو دادو ئاشتییە لە جیهاندا".

٣.بڕیـاری ژمـاره (٢٧٨٧)ی كۆمەڵـەی گشـتی نەتـەوە یـەگرتووەكان لـە (١٩٧١/١٢/٦)كە جەخت لەسـەر بـە پراكتیـك كردنـی كاریگـەر بـۆ مـافی چارەی خۆنووسین دەكات، كە دەبێتـە هۆی پتەو كردنـی پـەیوەندی دۆسـتانە لـە نێـوان گەلاندا، وە دڵنیایی دەبەخشێت بە مسۆگەر كردنی پاراستنی مافەكانی مرۆڤو پاراستنی ئاشتی لە جیهاندا.

٤.بڕیاری ژماره (٥٤٥)كۆمەڵـەی گشـتی نەتـەوە یـەكگرتووەكان ١٩٥٢/١٢/٥ جەخت لەسەر ئەوە دەكات كە پێشێل كردنی مافەكانی مرۆڤ بە تایبەتی مافی چارەی خۆنووسین ببووە هۆی خوێن ڕشتنو هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕ لە كۆنـدا، وە لـە كـاتی ئێسـتاشماندا دەبێتـە هـۆی هەرەشـەیەكی بـەردەوام لـە ئاشـتیو ئاسایشی نێو دەوڵەتی.

٥.بڕیـاری ژمـاره (١٦٠٣)ی كۆمەڵـەی گشـتی نەتـەوە یـەكگرتووەكان (١٩٦١/٤/٢٠) جـەخت لەسـەر ئـەوە دەكـات كـە پێشـێل كردنـی مـافی چـارەی خۆنووسین بە مانای پێشێل كردنی مافەكانی مرۆڤە، وەئەمەش ناگونجێت لەگەڵ بەڵێننامەی نەتەوە یەكگرتووەكاندا، و ڕێگرێك دەبێت لەبەردەم ئاشتیو هاوكاری نێو دەوڵەتیدا.

٦.بڕیاری ژمـاره (٢١٨٩)ی كۆمەڵـەی گشـتی نەتـەوە یـەكگرتووەكان كـە لـە ١٩٦٦/١٢/١٣دا دەرچووە، سەبارەت بە بڕواهێنانی كۆمەڵە كە هەر دواكەوتنێك لە پاككردنەوەو نەهێشتنی كۆلۆنیالیزم وە ڕێگە گرتنو كۆسپ لەبـەردەم پراكتیـك كردنـی پرەنسیپی مـافی چـارەی خۆنووسـین كۆسـپێكی جـدی دەبێـت لەبـەردەم هاوكاری نێو دەوڵەتی، وە ئاشتیو ئاسایشی جیهان دەخاتە مەترسیەوە.

٧.بڕیـاری ژمـاره (٢٩٠٨)ی کۆمەڵـەی گشـتی نەتـەوه یـەکگرتوەکان لـە (١٩٧٢/١١/٢٠) کـە دووبارە گەڕایـەوە جـەختی لەسەر ئـەوە دەکـرد، کـە بـەردەوام بـوون و بـەکارهێنانی هـەموو شـێوازەکانی جیـاوازی رەگـەز پەرسـتانە، دژی بەڵێننامـەی نەتـەوە یـەکگرتوەکان و دژی جـاڕدانی مافـەکانی مـرۆڤ و دژی راگـەیاندنی پێبەخشـینی سەربەخۆیی گـەلان و هەرێمـە داگیرکراوەکانـە ئەمانـە (جیاوازی رەگەز پەرستانە)، دەبنـە هـۆی هەڕەشە لێ کردن لـە ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی.

٨.سەبارەت بە بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان بڕیاری ژمارە (٢٠١٧)لە ١٩٥١/٣/٣و بڕیاری ژمارە (٤٨٣٥)لە ١٩٦١/٦/٩دا رایگەیاند کە دان پیانەنان بە مافی چارەی خۆنوسین، بەسەرچاوەی هەرەشەو بوونی مەترسی دادەنرێت بۆ ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی.

### ٩-٧ مافی مرۆڤ لە سێبەری بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا

پاراستنی مافـەکانی مـرۆڤ و ئازادییـەکانی هـەر لـە دامەزراندنیـەوە بەسـێ قۆناغدا تێپەڕیوە..

**قۆناغی یەکەم:** لەو بڕوایەدا بوون کە مافە سروشتیەکان هەر لە سەرەتاوە لـە یاسا سروشتی‌یەکانەوە سەرچاوە دەگرن، ئـەو یاسـایانە کـە حوکمـی گـەردوون دەکەن، لەبەر ئەوە جۆری ئەم ماف و سەربەستیانە شاراوە بوون و بە پلەی یەکەم پشتیان دەبەست بە ئارەزووی فەرمانڕەواکان.

**قۆناغی دووەم:** دەست پی کردنی هەوڵەکان بۆ دیاری کردنی مافەکانو ئازادییە سەرەکیەکان، وە هەوڵدان بۆ نوسینەوەیانو بەرەسمی کردنیان. یەکەم هەوڵ لەم بوارەدا..

أ-راگەیاندنی مافەکانی ئینگلیزی لە ساڵی ١٦٨٩دا.

ب-بەڵگەنامەی مافەکانی فرجینیا لە ساڵی ١٧٧٦دا.

ج-راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکا لە هەمان ساڵدا (١٧٧٦)دا پاشان راگەیاندنی مافەکانی ئەمەریکی (١٧٩١).

د-بەستنی ژمارەیەك لە پەیماننامەی نێو دەوڵەتی جۆراو جۆر لەوانە پەیماننامەی بەرلین ١٨٧٨ کە دەوڵەتە گەورەکان اعترافیان بە سەربەخۆیی سربیاو بولگاریاو رۆمانیا دا کرد بە مەرجێ ئەم دەوڵەتانەش دان بێنن بە مافو ئازادییە سەرەکیەکانی هاوولاتیان بەبێ جیاوازی بەهۆی بیرو باوەڕو ئاییینەوە.

ه-رێکەوتننامەی لاهای ١٩٠٧ ئەمە دانپیانان بوو، لەلایەن ئەو دەوڵەتانەی کە ئیمزایان کردبوو، بە پێداویستی رێزگرتن لە مافو کەرامەتی خێزانو ژیانی خەڵكو بیرو باوەڕە ئاییینیەکان، کۆتایی ئەم قۆناغە بە هێنانە کایەی رژێمی پاراستنی کەمە نەتەوییەکان هات کە لە سەردەمی کۆمەڵەی گەلاندا هاتە دامەزراندن.

**قۆناغی سێیەم:** دەست پێکردنی ئەم سەردەمە لەگەڵ دامەزراندنی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دا دەست پێدەکات. کە زیاتر جەختی لەسەر رێز گرتن لەو پرەنسیپە دەکات کە دەڵێت: هەموو یەکێك لە ئەندامانی گەل، مافو سەربەستی خۆی هەیە کە یاسا نێو دەوڵەتی یەکان دانی پیاناوە، بەبێ گوێدان بە (باری سیاسیو یاسایی) ئەو کەسە لە دەوڵەتەکەی خۆیدا.

پاراستنی نێو دەوڵەتی بۆ ئەم ماف و سەربەستیانە شێوەی پایەند بوون یان وەرگرتووە بە پشت بەستن بە بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان وە ڕێکەوتن نامەکان لەوانەش:

١.ڕێکەوتننامەی تەحریم کردنی لەناو بردنی مرۆڤایەتی (لەناوبردنی بەکۆمەڵ جینۆساید) کە لە ساڵی ١٩٤٨دا ڕاگەیەنرا.

٢.جاڕدانی جیهانی بۆ مافەکانی مرۆڤ لە ١٩٤٨دا.

٣.ڕێکەوتننامەی نێو دەوڵەتی سەبارەت بە باری پەنابەرەکان (ئاوارەکان) لە ساڵی ١٩٥١.

٤.ڕێکەوتننامە سەبارەت بە مافە سیاسیەکانی ژنان کە لە ساڵی ١٩٥٢ڕاگەیەنرا.

٥.ڕاگەیاندنی پێبەخشینی سەربەخۆیی بۆ گەلان و هەرێمە کۆلۆنیاڵ کراوەکان لە ساڵی ١٩٦٠دا.

٦.ڕاگەیاندنی نەهێشتنی جیاوازی ڕەگەز پەرستانە ١٩٦٥.

٧.پەیمانی مافە سیاسیو شارستانیەکان لە ساڵی ١٩٦٦داو مافە ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی و ئابووری‌یەکان لە ساڵی ١٩٦٦دا.

سەبارەت بە بەهای یاسایی بۆ (مافەکانی مرۆڤ) لەبەر ڕۆشنایی بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا. ئەوە بوو کە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەم بڕیارەی گرتەخۆ (داننان بە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە سەرەکیەکانی پێداوستی پاراستنی) لە بڕیاری ژمارە (٢٢٠٠)کە لە ١٩٦٦/١٢/١٦دا ئەم بڕیارەی خستە بەردەم وڵاتانی ئەندام بۆ ئیمزا کردن و پاشان پێ‌ڵێ نان و گرتنە خۆی. کە تایبەت بووە بە:

١.پەیمانی نێو دەوڵەتی تایبەت بە مافە شارستانی و سیاسیەکان.

٢. پـەیمانی نێـو دەوڵـەتی تایبـەت بـە مافـە ئـابوریو کۆمەڵایـەتیو رۆشنبیرییەکان...هتد.

٣. پرۆتۆکۆڵـی رەزامـەندی تایبـەت بـە پەیمانـە نێـو دەوڵەتیـەکنی مافـە شارستانیو سیاسییەکان...

وەئاماژە بۆ ئەوە دەکات ئەم بەڵگەنامانە بە ملزم-پابەند بوون دانانرێت بۆ دەوڵـەتانی ئـەندام لـە نەتـەوە یـەکگرتووەکان، تەنـها دوای سێمانگ نـەبێت لـە مێـژووی دانانیـەوە (أیـداع) پاشـان دان پیانـان وەیـان چوونـە نـاوەوە واتـە "انضمام"کردن بۆ بەڵگەنامەکە.

بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە حەوت شوێندا جەخت لەسەر مافەکانی مرۆڤو سەربەستیە سەرەکیەکان دەکات، ئەویش لە (دیباحە-مادەی (١)، ماددەی (١٣)، ماددەی (٥٥)، ماددەی (٦٢)، مادەەی (٦٨)، ماددەی ٧٦).

بەلام سەبارەت بە بەها یاساییەکەیئەم پەیماننامە نێو دەوڵەتیانە جیاوازی لە بۆچوونی یاسا ناسەکاندا هەیە،کە ئایا (ملزم) دەبێت پابەند بن پێوەی، یان مەرج نییە پابەند بوون پێوەی.

سەبارەت بـەم بۆچوونـە (کـە مافـەکانی مـرۆڤ)ملزمـە یـان نـا دوو قوتابخانـە هەیە:

١. یەکەم قوتابخانە رای وایە کە ملزم نییە واتە مەرج نییە دەوڵـەتانی ئەندام پێوەی پابەند بن، لەبەر ئەوەی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم بڕیارەی وەك راسپاردەیەك دەرکـردووە. چونکـە کۆمەڵـەی گشـتی نەتـەوە یـەکگرتووەکان پسپۆریەتی یاسا دانانی نییە.

کەواتە ئەمە دەمان گەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە کۆمەڵە تەنها مافی دەرکردنی راسپاردەی غیر ملزم ی هەیە.

٢.قوتابخانەی دووەم: دەڵێت بڕیاری کۆمەڵەی گشتی بۆ مافەکانی مرۆڤ ملزمە پابەند بوونی هەموو دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان بەبڕیارەکانەوە دەگرێتەوە. لەبەر ئەوەی ئەو ڕاگەیاندنە بەشێکە لە میثاق- بەڵێننامە کەواتە دەبێت وەك بەڵێننامەش ملزم بێت.

وە مافی چارەی خۆنووسین لەهەمان کاتدا مافێکە لە مافە مرۆیی‌یەکان هەرچەندە کە جاڕدانی جیهانی بۆ مافەکانی مرۆڤ بە ئاشکرا دەقێکی بۆ تەرخان نە کردووە، بەڵام لەچەندەها شوێن جەخت لەسەر ئەم پرەنسیپە بە شاراوەیی دەکاتەوە. بەتایبەتی لە مادەی (١)ی بڕگەی (٣)دا کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ویستی گەل سەرچاوەی دەسەڵاتی حکومەتە، وە دەربڕینی ئەم ویستەش بەهۆی هەڵبژاردنەوە دەبێت، ئەمەرجێك بە شێوەیەکی نهێنی‌و دوور لە ساختە کردن وە لەسەر بناغەی یەکسانی‌و سەربەستی دەنگ دانەوە بەڕێوە ببرێت. کەواتە مافی چارەی خۆنووسین ئەرکێکی یاساییە لە ئەستۆی هەموو دەوڵەتانی ئەندام لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی‌دا.

## ـ هەڵسەنگاندنی یاسایی مافی چارەی خۆنووسین بە شێوەیەکی گشتی لە ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکاندا

مافی چارەی خۆنوسین لە کۆمەڵەی گەلان‌و ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، سەبارەت بە کۆمەڵەی گەلان لە دوو بەندی بەڵێننامەی کۆمەڵەی گەلاندا باسی لێوە کراوە لە فەسڵی ئامانج‌و پرەنسیپەکان‌و لە فەسڵی هاوکاری ئابووری‌و کۆمەلایەتی‌دا.

بڕگەی دووەم لە مادەی یەکەم ئاماژە بۆ ئەوە دەکات (لە پێناوی گەشە کردنی پەیوەندی دۆستایەتی نێوان گەلاندا، ئەم گەشە کردنە بنیاد بنرێت لەسەر بناغەی رێزگرتن لە یەکسانیان لە ماف و دیاری کردنی چارەنوسیاندا).

هەروەها بە هەمان شێوە مادەی (٥٥)لە بەڵێننامە ئاماژەی بۆ دەکات، پاشان دێیەنە سەر فەسڵی یازدەهەم دوانزەهەم، سیازدەیەم.

لە بەڵێننامەی دەستەی نەتەوەکان (هیئه الامم) بەهەمان شێوە باس لە مافی چارەی خۆنووسین دەکاتەوە، ئەگەر بەراوردی بکەین بە بەڵێننامەی کۆمەڵەی گەلان کە زیاتر لە مادەی (٢٢) لە بەڵێننامەی کۆمەڵەی گەلان باسی لێوە کردووە..

فەسڵی یازدەهەم لە رووی نێو دەوڵەتیەوە، بە پێشکەوتنێکی گەورە دادەنرێت لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیدا، کە باس لە لێپرسراوێتی کۆمەڵی نێو دەوڵەتی دەکات، بەرامبەر بە گەلانی تر کە حوکمی خۆیان بکەن.

سەبارەت بە فەسڵی دوانزەهەم و سینزەهەم، لە تایبەتمەندێتی رێکخراوی نەتەوەکان دەدوێت و دەسەڵاتی فەرمانڕەواکانیش لە ژێر چاودێری ئەنجومەنی گشتی و ئەنجومەنی ئاسایشدا دەبێت.

بەڵام ئایا ئەو گەل و نەتەوانە دەبێت کێ بن کە مافی دیاری کردنی چارەنووسی خۆیان هەبێت؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانەش ئەگەر سەیری (مادەی ١)لە بەڵێننامەکە بکەین، مەبەست لە (گەل) واتە دانیشتوانی دەوڵەت دەگرێتەوە، ئەم دەربڕینە کۆکردنەوەی بیرۆکەی دەوڵەتی تەواو دروست بووە لەگەڵ ئەو گەلانەی کە لە رێگەی دروست کردنی دەوڵەتدان.

بەڵام مادەی (٧٣)پێناسە یان دەکات بەوانەی نەگەیشتونەتە پلەی کامڵ بوون واتە نەگەیشتونەتە ئەو پلەی بتوانن حوکمی خۆیان بە خۆیان پێ ی هەڵسن،

بەهۆی بارودۆخی نێو دەوڵەتیەوە کە نەیانتوانیوە بکەونە سەرپێ، کەواتە مافی چارەی خۆنووسین واتە مافی سیاسی گەلان و سەربەستی‌یە مرۆییەکان.
لەسەردەمی کۆمەڵەی گەلاندا زۆربەی گەلان سەربەخۆیی خۆیان بەدەست نەهێنا بوو، دەتوانین ئەو دەوڵەتانە بکەین بە دوو جۆرەوە، جۆرێکیان ئەو دەوڵەتانە بوون کە لەژێر چەپۆکی دگیرکەرانەی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان خۆیاندا بوون، دەوڵەتە زلهێزەکان نەك هیچ زەوییەك لە شوێنە داگیر کراوەکان، (کۆلۆنیالیزمەکانیان) لە کیس خۆیان نەدا بەڵکو بە پێچەوانەوە زەوی زیاتریان خستە سەر سنوری قەڵەم رەوی خۆیان، لە ئەنجامی سەرکەوتنەکانیان بەسەر محوەر-تەوەردا.
جۆری دووەم ئەو دەوڵەتانە بوون کە لە ژێر چەپۆکی دەوڵەتانی تەوەردا بوون. وەلەبەر ئەوەی لە شەڕدا دۆڕا بوون رژێمێکی تازەیان بۆ هێنانە کایەوە بۆ رێکخستنی بارودۆخی تازەی دروست بووی نێو دەوڵەتی ئەویش بریتی بوو لە سیستەمی سەرپەرشتی-انتداب. (Mandatory System)..(٢٢)
لە سەرەتای سەدەی بیستەم، لە کۆنگرەی پاریس دا دوای شەڕ ئەو پرسیارە هاتە گۆڕێ (ئەبێت چی لە سەروەت و سامانی دەوڵەتانی تەوەر بکەن). بۆ ئەو مەبەستە سێ ڕێگا هەبوو لەبەردەمیاندا ئەویش:
یەکەم: یا ئەوەتا سەرلەنوێ دابەش کردن و گرتنە خۆی زەویەکان.
دووەم: یان بەرێوە بردنی ئەو دەوڵەتە بە شێوەیەکی راستەوخۆ دەبێت.
سێیەم: یان رژێمی سەرپەرشتی (انتداب)یان بەسەردا دەسە پێنرێت.
بەم شێوەیە بڕیار درا لەسەر ئەم رژێمە کە لە مادەی (٢٢) لە بەڵێننامەی کۆمەڵەی گەلاندا تێهەڵکێش بکرێت. کە ئەمیش خۆی لە خۆیدا بەشێك بوو لە پەیماننامەی ئاشتی (معاهدات السلام)، بە پێی ئەم رژێمە واتە (رژێمی سەرپەرستی)، ئەو زەویانەی کە لە ژێر چەپۆکی دەوڵەتانی تەوەردا بوون، ئەو

زەویانەی کە کەس خاوەنیان نی‌یە، دەتوانرێت بدرێتە دەست دەوڵەتە زلهێزەکان، ئەو کاتە پیّیان دەوترێت دەوڵەتانی سەرپەرشتیار. ئەم دەوڵەتە زلهێزانە ئەو دەوڵەتانەیان بەرێوە دەبرد لە جیاتی کۆمەڵەی گەلانو ئەمەش بەپێی ئەو رێکەوتننامانەی کە دەبەستران، لە نێوان دەوڵەتانی سەرپەرشتیار (دول الانتداب) لەگەڵ کۆمەڵەی گەلاندا.

لە نێوان سیستەمی سەرپەرشتیو پێکەوە لکاندنو گرتنە خۆدا، کە زیاتر رووی داگیرکەرانەی پێوە دیارە جیاوازی هەیە کە بریتین لە:

یەکەم: دەوڵەتی ئینتداب ناتوانێت مامەڵەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بکات، وەك مامەڵە کردنی لەگەڵ ئەو گەلانەی کە سەر بەون یان لە ژێر دەستیدان.

دووەم: هەموو رێکەوتنێکی سەرپەرشتی مانای لێ خۆش بوون (تنازل) ناگەیەنێت بۆ دەوڵەتانی ئینتداب، وە هەتا بە نسبەت ئەو زەویانەش کە لە پلەی سێدان، ئەمەش دادگای دادی نێو دەوڵەتی (محكمە العدل الدولیە) سەبارەت بە باشووری خۆرئاوای ئەفەریقا بڕیاری لەسەردا.

سێیەم: دەوڵەتی سەرپەرشتیار مافی لێ خۆش بوونی نی‌یە لەسەر ئەو زەویانە، بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە کۆمەڵەی گەلان.

چوارەم: دەوڵەتی ئینتداب مافی تجنید-کۆئامادەکاری کردنی خەڵکانی نی‌یە، بەبێ مەرجی دیاری کراو.

پێنجەم: دەوڵەتی ئینتداب مافی ئەوەی نی‌یە، کە یاسای رەگەزنامە-الجنسیەی خۆی بەسەر دانیشتوانی ئەو ناوچەیەدا بسەپێنێت.

سەبارەت بە سروشتی رژێمی ئینتداب مەبەست لێ ی جۆرە سەرپەرشتیاری کردنێکە لە بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتەی کە گوایە دەیانەوێت چاودێری بکەن. وە لەسەر زمانی دادگای دادی نێو دەوڵەتی کە دەڵێت: ئەم رژێمە دۆزرایەوە لە پێناوی بەرژەوەندی دانیشتوانی ناوچەکە، ولەپێناو بەرژەوەندی هەموو

مرۆڤایەتیدا. وەك چەمكی نێو دەوڵەتی ئامانجی نێو دەوڵەتی هەیە. ئەمە گەورەترین ئەمانەتی شارستانێتی پیرۆزە. ئەمەش وادەكات كە بنەماكانی ئەم رژێمە، ببێتە هۆی پێبەخشینی كەسایەتی نێو دەوڵەتی بەو ناوچانە. ئەو زەوییانەی كە بە زەوی ئینتداب ناو دەبران كرابوون بە سێ گروپەوە:

جۆری یەكەم.. عێراق و فەلەستین و سوریاو لوبنان دەگرێتەوە، رێكەوتننامەكان ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن كە ئەم دەوڵە تانە وایان لێ بكرێت بەرەو سەربەخۆ بوونی ئابووری برۆن.

جۆری دووەم.. "كامیرۆنی بەریتانی و فەرەنسی" هەروەها "تۆجۆلاندی بەریتانی و فەرەنسی" وە "ئەنجانیقا" لەگەل "رواندی برۆندی" دەگرتەوە. دەوڵەتانی سەرپەرشتیار بەرامبەر بەم ناوچانە ئەركی سیاسیان هەبووە، بەڵام بە هیچ جۆرێك نەیان گەیاندۆتە رادەی ئەوەی كە ئەركەكانیان بەرەو ئەوە بڕوات كە مافی سەربەخۆییان پێببەخشن.

جۆری سێیەم.. وای لە (دەوڵەتانی سەرپەرشتیار) دەكرد كە بتوانن زۆر لە زەوی ولاتانیتر بگرێتەخۆ وەك دەستكەوی شەڕ. ئەمانەش گوایە بەهۆی بچوكی قەوارەكانیان و بەهۆی بە دەگمەن بوونی دانیشتوانیان، ئەم زەوییانەش بریتی بوون لە باشوری رۆژئاوای ئەفەریقا و سامو ناور دورگەی باسفیك باشورو باكور.

بەڵام راستییەكی تاڵ هەیە كە پێویستە بوترێت، ئەوەیە كە كۆمەڵەی گەلان بەپێی پێكهاتەی دروست بوون و یاساكانی نەبووە جێگرەوەی ئیمپراتۆریەتەكان بەمانای ئەوەیوەك میراتگرێك بێت، بەڵكو ئامرازێكی تازە بوو كە ئیمپراتۆریەتە كۆنەكان دەیان ویست بەكاری بهێنن یان ئەو دەست كێشە ئاوریشمە بوو كە چرنوكی داگیر كەرانی تازەی دادەپۆشی.

لەبەر ئەوە سەیر دەكرا كە كۆمەڵەی گەلان، وەك رێكخراوێكی ئیفلیج بوو لە جوڵەو كار كردن هاتە گۆڕێ. هۆكارەكەشی دەگەرێتەوە بۆ:

یەکەم: لەبەر ئەوەی هەموو ئەندامێك مافی (نقص) واتە هەڵوەشاندنەوەی هەبوو، لەهەمان کاتدا خودی کۆمەڵە ئەوەندە بەهێز نەبوو تابڕیارەکانی جێبەجی بکرێت..

دووەم: لەبەر ئەوەی بڕیارەکانی کۆمەڵە وەك ئەرکێکی (غیر ملزم) واتە بێپابەند بوون مایەوە. پاشان ئەگەر بێینە سەر سەردەمی دەستەی نەتەوە یەککگرتووەکان(هیئە الامم المتحیدە) ڕووداوەکان پەرەیان سەند، بە تایبەتی گەلانی چەوساوە ئایا لە ژێر چاودێرییەکی نێو دەوڵەتیدا بوون، یان لە ژێر حوکمێکی ڕاستەوخۆی دەوڵەتە داگیرکەرەکاندان، پاشان مافی ئەو گەلانە لە دیاری کردنی چارەنوسیاندا..

دەست پێکردنی مێژووی دەستەی نەتەوە یەککگرتووەکان هەر وەك کۆمەڵەی گەلان لە ڕاگەیاندنەکانی هاوپەیمانەکانەوە لە پەیمانو بەڵێنەکانیان دەست پێدەکات، کۆڕو کۆبونەوەکانیان لە بەڵێننامەی ئەتلەنتی ساڵی ١٩١٤ دەست پێ دەکات.

پاشان (تصریح هیئە الامم-لێدوانی نەتەوە یەککگرتووەکان)لە ساڵی ١٩٢٤و لێدوانی مۆسکۆ ساڵی ١٩٢٣ وە کۆنگرەی (دمبارتون ئەوکس) ساڵی ١٩٤٤ پاشان کۆنگرەی یاڵتا ساڵی ١٩٤٤ وە لە کۆتایدا کۆنگرەی (سان فرنسیسکۆ) ساڵی ١٩٤٥ لەم کۆنگرەیەدا ئاماژە بۆ ئەوە کرا، کە پرەنسیپی مافی یەکسانی گەلان، و پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسین دوو تەواوکەری یەکترن بۆ یەك ئاستی هەڵسو کەوت و (سیستمی پێسپێری-نظام الوصایة)هێنانە کایەی ئەم سیستەمە بۆ ئەوەی جێگای سیستەمی ئینتدابی کۆن بگرێتەوە. لە مادەی (٧٥)لە بەڵێننامەی دەستەی نەتەوەکان باسی لێوە دەکات. کە دەڵێت: دەستە ئەم ڕێسایەی داهێناوە بۆ بەڕێوە بردنو چاودێری کردنی ئەو زەویانەی لە ژێر ڕاسپاردەییدا بوون، وە ئەم زەویانەش سێ جۆرن:

یەکەم: ئەو زەوییانەی کە لە ژێر سەرپەرشتی دا بوون بە پێی مادەی (٢٢) لە بەڵێننامەی کۆمەڵەی گەلان.

دووەم: ئەو زەویانەی کە لە وڵاتە ژێر کەوتووەکان (دۆڕاوەکانی شەڕ) دابڕا بوون.

سێیەم: ئەو زەویانەی کە دەوڵەتە زلهێزەکان سەروەری تەواویان بەسەردا هەبووە، وئەو دەوڵەتانەی بەویستی خۆیان دەیان ویست بچنە ژێر رژێمی چاودێری کردنەوە بە پێی مادەی (٧٧) لە (بەڵێننامە-میثاق).

یەکێك لە ئامانجەکانی (سیستەمی پێسپێری-نظام الوصایة)بریتی بوو لە گەشە پێدانی ئەو ناوچانەو پێش خستنیان لە رووی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو پەروەردەییو ئامانجی دووەم بریتی بوو لە رێز گرتن لە مافی مرۆڤ لەو ناوچانەدا.

ئامانجی سێیەم بریتی بوو لە کارکردن لە پێناوی بڵاوکردنەوەی ئاشتی سەرتاسەری لە جیهاندا. بۆ جێبەجی کردنو بە پراکتیك کردنی ئەم رێسایەو بەرێوەبردنیو چۆنیەتی چاودێری کردنی، ئەنجومەنی تایبەتی بۆ دامەزرا کە بە یەکێك لە شەش دەزگا سەرەکیەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دادەنرێت.

بەڵام سەبارەت بەو زەوییانەی کە سەربەخۆ نین (رژێمی پێسپێری) بەسەردا جێبەجی نەدەکرا. سیستەمی نەتەوە یەککگرتووەکان بەشێوەیەکی گشتی باس لە مافەکانی مرۆڤو سەربەستیان دەکاتو وە رزگار کردنی مرۆڤ لە ژێر حوکمی بێگانە یەکێکە لەو خاڵە گرنگانەی کە ئاماژەی بۆ دەکات، چونکە دژ بە خواستو ویستی دانیشتوان بەسەریاندا زاڵ بوون. کەواتە پێویستە لەسەر دەوڵەتانی فەرمانڕەوا، خواستەکانی دانیشتوانی ئەو ناوچانە پێشێل نەکەن وەدژی ئامانجە سیاسیە کانیان نەوستن.

## ١١ـ هۆیەكانی پەیڕەو كردنی مافی چارەی خۆنووسین

ئەو هۆكارانـەی كـە مـافی چـارەی گـەلان دابـین دەكـەن لـە دیـاری كردنــی چارەنوسیاندا، بە ئامادەكردنی (توصیات-پێشنیار)ی پێویست بۆ لێكۆڵینەوە لە لایەن كۆمەڵەی گشتی (UN)، بۆ ئەم مەبەستەش بڕیاری ژمارە (٥٤٥)زیاد كرا كە ئاماژە بۆ مافی چارەی خۆنووسین دەكات لە بەڵگەنامەی مافەكانی مرۆڤدا.

لـە لیژنـەی مافـەكانی مرۆڤـدا سـەبارەت بـە زیـاد كردنـــی ئـەم بڕگەیـە، مقۆمقۆیەكی لەسـەر دروسـت بـو، لـەم رووەوە دوو بۆچـوون هـەبوون: بۆچوونـی یەكـەم دەڵێت كە ئەم شێوازە پێویسـتە هـەموو خـەڵكان رازی بكـات، بـۆ ئـەوەی هەموو خەڵكانیش لەسەری رازی بن. بۆچوونی دووەم دەڵێت كە بنەمای مافەكانی مرۆڤ بەڵگەنامەیەكی یاسایی‌یە، و مافی چارەی خۆنووسین مافێكی سیاسی‌یە، لەبەر ئەوە نابێت ئەم مافە (مافی چارەی خۆنووسین)، كە یەكێكە لە پرەنسیپە گشتی‌یەكان لـە بەڵگەنامەیـەكی یاسایی‌دا، نـابێت ئامـاژەی بۆ بكرێـت، هەرچەندە ئەم پرەنسیپە بەرپەرچ دەدرایەوە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خرایە بەرنامەوەو لە مادەی (١) لـە پـرۆژەی بەڵگەنامـەی مافـە ئـابووری‌و كۆمەڵایـەتی‌و رۆشـنبیرییەكان، ولـە پرۆژەی بەڵگەنامەی مافە شارستانی سیاسی‌یەكان ئاماژەی بۆ كراوە.

سەبارەت بە پراكتیك كردنی ئەم مافە مادەی (٤٨)لە پـرۆژەی بەڵگەنامەكەدا، ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە پێویستە لەسەر هەموو دەوڵەتە فەرمانڕەوكان پەیوەست بن بە جێبەجێ كردنی مادەی (١)لە رێگەی هۆیەكانی دیموكراسیەوە.

## ١١-١ ليژنەی لیکۆڵینەوە (لجنە الاستقصاء)

ئەمەش بریتی‌یە لە کۆمەڵێ لە کەسان کە ژمارەیان لە دوو کەس کەمتر نەبێت، کە دەوڵەتێکی دیاری کرا، وەیان دەوڵەت یان لایەنێکی بێلایەن پێی هەڵستێت، بۆ زانینی خواستی دانیشتوان لە رێگەی سەرکردەکانیانەوە، یان لە رێگەی کۆڕو کۆبونەوەکانیان، دوای گوێ گرتن لێ یانو خوێندنەوەی سکاڵا نامەکانیان، کەمو کورتی ئەم رێگایە ئەوەیە کە گوایە گەل دابەش دەکات بەچەند کۆمەڵێکەوە، واتە دابەشکردنی ویستی گەل، وەئەم ویستەش دیموکراسی تێدا نابێت. چونکە هیچ پێوانەیەکی زانستیانە نی‌یە کە بتوانێت پێوانەی خواستو ئارەزووی هاووڵاتیانی پێ تاقی بکرێتەوە، چونکە هەر حوکمێك بدرێت لەم حاڵەتەدا لەژێر کاریگەری کەسایەتی‌دا دەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە بە رێگەیەکی چاك دەزانرێت، وەك سەرەتایەك بۆ زانینی خواستو ئارەزووی خەڵکانی ناوچەکە، ئەم رێگەیە لە زۆر بۆنەدا بەکاریان هێناوە کۆنترینیان لە مەسەلەی دوورگەی (ئالاند) بوو لە نێوان سویدو فنلەندە ساڵی ١٩٢٠، هەروەها مەسەلەی موسڵ وەیان ئەو پێشنیارەی کە سەرۆك کۆماری (ئیرلەندەی ئازاد) بە پێك هێنانی لیژنەی لێکۆڵینەوە بۆ زانینی ئارەزووی هاووڵاتیانی نزیك سنورەکانی لەگەڵ ئیرلەندەی باکوری بەباش زانی.

## ١١-٢ پێسپێری (الوصایە)

هەرچەندە پێسپێری بە یەکێك لە هۆیەکانی -وسائل مافی چارەی خۆنووسین دانانرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك ئامرازێکی نێو دەوڵەتی بەکار دەهێنرێت.

که فرسەتێك دەبەخشێتە هاوولاتیان، بۆ بیر کردنەوەو بڕیاردان لە ژیانی سروشتی خۆیان، باش دروست بوونی بارودۆخی تایبەت بە پشتگیری کردن‌و بێلایەنی هاوولاتیان بەرەو قۆناغی سەربەخۆیی یان پرس پی‌کردنیان لە دیاری کردنی چارەنوسیاندا دەگوێزرێنەوە.. ئەم رێگایە لە سۆماڵ‌و لیبیا بەکاریان هێنا، هەروەها ئەم رێگەیە دەشبێت وەك سەرەتایەك بۆ (راپرس-استفتاء)کردن بەکار بهێنرێت بۆ کار کردنە سەر دانیشتوان‌و زۆر لێکردنیان..

**١١-٣ هەڵبژاردن (الانتخابات)**

ئەم رێگەیە بەکاردێت لە حاڵەتێکدا ئەگەر ویست‌و ئارەزووی دانیشتوان ئاشکرا نەبوو، زیاتر لەیەك دەستەی نیشتمانی، خۆی بە لێپرسراوو دڵسۆز بزانێت، هەریەکەیان تێگەیشتن‌و بۆ چوونی تایبەت بە خۆی‌و لێکدانەوەی جیاوازیان هەبێت سەبارەت بە دیاری کردنی چارەنوسیان.

ئالەم کاتەدا هەڵبژاردن پێش مافی چارەی خۆنووسین دەکەوێت، دەستەی نیشتمانی سەرکەوتوو یان ئەوەتا یفراندۆمێکی دیموکراسی دەکات بۆ دڵنیا بوون لە خواستی دانیشتوان بۆ زیاتر جەخت کردن لەسەر پاکێتی‌و راستی خۆی، یان ئەوەتا لە رێگەی دەنگدانەوە لە هەڵبژاردندا کە زۆرینەی دەنگەکانی بەدەست هێنا، ئەمەش مافی (پێسپێری-وصایە) لە لایەن ئەو گەلەی پی‌دەبەخشێ، کە بڕیاری مافی چارەنووسیان بدات لە جیاتی ئەوان، بەتەنها کەم‌و کورتیەك لەم هەڵبژاردنەدا ئەوەیە کە گرنگی نادات بەرای ئەوانەی کەدەنگیان نەداوە هەروەها رای کەمە نەتەوەییەکان.

جیاوازی سەرەکی هەیە لە نێوان (راپرس‌و هەڵبژاردنی گشتی‌دا) لە راپرسی‌دا، تاقی کردنەوەیەکە کە دەستەیەکی بێلایەننی نێو دەوڵەتی دیاری کراو پێی هەڵدەستێت، بەلام هەڵبژاردن هەمیشە حکومەت یان دەزگاو لایەنی

حکومەتی هەمیشەیی یان کاتی پێی هەڵدەستێت، ئەمە جگە لەوەی کە راپرسی مەسەلەیەکی چارەنوسیەوە کاریگەری یەکەی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژە، یان هەمیسەیی دەبێت. بەلام هەڵبژاردن کاریگەرەکەی کاتی یەو دووبارە دەبێتەوە بۆ مەبەستی جیاجیا.

## ١١-٤ گەرانەوە بۆ گەل (الرجوع الی الشعب)

مەبەست لەوەیە گەرانەو بۆ ئەنجومەنی نوێنەرایەتی گەل بۆ راوێژ پیکردنیان وەزانینی ئارەزووی دانیشتوان سەبارەت بە هەر بریارو دەستورێك کە بیانەوێت دابنرێت، یان بریاری کۆتایی لەسەر بدرێت ئەم رێگایە هەر زۆر لەکۆنەوە پەیرەو کراوە بۆ نەهێشتنی خراپە کاری دیموکراسیەت.. لەبەر ئەوەی (گەل)پرسی پێ دەکرێت تەنها لە کاتی هەڵبژاردندا ئەگینا لە هیچ بوارێکی‌ترداو هیچ بریارێکی چارەنوسی‌دا پرسیان پێ ناکرێت. کەواتە هەموو کەسێك پاش هەڵبژاردن دەروات بەلای کاری خۆیەوە، تەنها ئەنجومەنی نوێنەران دەمێنێتەوە کە بریار دەدات و چارەنوسیان دیاری دەکات جا رازی بن یان رازی نەبن.

گەرانەوە بۆ گەل، پەیوەندی‌یەکی راستەوخۆی هەیە سەبارەت بە مەسەلەی مافی چارەی خۆنووسین، لە حالەتێکدا ئەگەر رێگای هەڵبژاردن بەکار هێنرا لە جیاتی راپرس و یەکێك لە حزبە سەرکەوتووەکان هاتە سەر کارو دەستەی فەرمانرەوایی پێك هێنا، لەسەر دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسین بەهۆی هێنانەکایەی یەك ئەنجومەن بۆ یاسادانان یان زیاتر لەیەك ئەنجومەن لەبەر چەند هۆکاری سیاسی یان دیموکراسی رێگە بە گەل دەدات کە ویستی خۆیان بە شێوەیەکی یاسایی دەرببڕن پێش جێبەجێ کردنی.

## ١١-٦ راپرسی (الاستفتاء)

مەبەست لە راپرسی.. زانینی ویستی دانیشتوانە لە مەسەلە چارەنووس سازەکاندا. (سارە رامبو) دەڵێت: ئەمە رێگایەکی بەسوودە بۆ مەسەلەی مافی چارەی خۆنووسین بۆ ئەو زەوییانەی کە بۆچوونی رای گشتی ئاشکرا نییە یان رای گشتی تیایدا زۆر هەستەوەرییە لە دابەش کردنیدا.

سەرهەڵدانی ئەم رێگایە دەگەرێتەوە بۆ دوای ئەو شۆرشانەی لە ساڵانی ١٨٤٨دا روویان دا، کە بیرو باوەری نەتەوەیی زیاتر بڵاو بوبۆوە، پاشانیش داننانێکی یاسایی و نێو دەوڵەتی پەیدا بوو بۆئەم پرەنسیپە.

بە تایبەتی لە پەیمانامەی پاریس لە ساڵی ١٨٥٦ وە پەیماننامەی فیلالفرانکا ساڵی ١٨٥٩، و پەیماننامەی پراخ ساڵی ١٨٦٦، پاشان چەند هەوڵێك درا بۆ بە پراکتیك کردنی ئەم پرەنسیپە ساڵی ١٨٣٣دا بۆ نەهێشتنی ناکۆکی لە نێوان (پیرۆو شیلی)دا هەروەها بۆ بە ئەنجام گەیاندنی راپرس لە (شلزوج) هەروەها لە "ئەلزاس و لۆرین"دا.

بەڵام ئەم هەوڵانە هەر هەموی شکستی هێنا، بەهۆی دەست تێوەردانی هێزەکانی روسیا، ئیتر ئەم رێگایە بەکار نەهێنرا هەتا پاش کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم، وە گوێگرتنی جیهان بۆ بەڵێنەکانی هاوپەیمانەکان بە تایبەتی لێدوانی سەرۆك کۆماری ولاتە یەکگرتووەکان سەرۆك (ویلسن) بە چواردە خاڵەکەی، کە جارێکیتر هەموو چاوەروانی رێگایەکی راپرسیان دەکرد کە هۆکارێك بێت بۆ نەهێشتنی ناکۆکیەکانیان، هەرچەندە ئەم پرەنسیپە لە هەندێ حاڵەتدا بە ئەمەك دارییەوە پراکتیك کرا، بەڵام لە هەندێ کاتی تردا بەتەواوی خۆیان لێ گێل دەکرد. چونکە لە نێوان خۆیاندا رێکەوتبوون کە پراکتیك ئەکرێت، لەبەر ئەوەی دژی بەرژەوەندییەکانی خودی دەوڵەتە زلهێزەکان بوو.

سەبارەت بە پۆلێن کردنی ئەم ڕێگایە لە رووی یاساییەوە، بۆ دوو ڕێگا دابەش دەکرێت، یەکێکیان رەسمیو ئەوی تریان نارەسمی.

سەبارەت بە ڕێگەی یەکەم کاتێك دەبێت ئەگەر هاتوو لە ئەنجامی ڕێکەوتنی دو دەوڵەت یان زیاتر بۆ پێهەڵسانی بە ڕێگەیەکی بێلایەنی پەیڕەو بکرێت. یان هەر هیچ نەبێت چەند لایەنێکی دیاری کراو پێی بزانن بە تایبەتی لایەنی مەبەست، ئەم جۆرە راپرسانە لە "مۆلداڤیا، ئاشیا"دا وە لە دوورگەی (ئایۆنین) هەروەها لە نەرویج پراکتیك کرا. سەبارەت بە ڕێگەی دووەم.. واتە ڕێگەی نارەسمی ئەم ڕێگایە یان ئەم جۆرە بەبێ ڕێکەوتنی لایەنە پەیوەندی دارەکان جێبەجێ دەکرێت، یان بەهۆی یەك لایەن بە تەنها دەبێت کە لەلای خۆیەوە ئەنجامی بدات، یان لایەنی پێشنیار کراو خۆی پێی هەڵدەستێت، جا ئەگەر بە چاکی یان بە پێچەوانەوە ئەنجامی بدات، بە ئارەزووی خۆی نمونەی ئەم جۆرەیان وەك ئەوەی شۆرشی فەرەنساو ئیتالیەکان پێی هەڵسان لە نێوان سالانی ١٨١٨ تا سالانی ١٨٧٠دا.

دەتوانین بڵێین کە زۆربەی زۆری ئەو راپرسیانەی کە دەکرا، پێش سالانی جەنگی جیهانی یەکەم هەموویان لە جۆری دووەم واتە نارەسمی بوون..

## ١٢ مەرجو کۆسپەکانی مافی چارەی خۆنووسین

### ١٢-١ مەرجەکان

بۆئەوەی دەوڵەت کەسایەتی نێو دەوڵەتی هەبێت، پێویستە چەند مەرجێکی سەرەکی تێدا بەدی بهێنرێت.

ئەوانەی کەداوای مافی چارەی خۆنووسین دەکەن، بۆ ئەوەی پێک هێنانی دەوڵەتی خۆیان، دەبێت چەند مەرجێکی سەرەتایی یان پێشینەیی هەبێت، کە تێدا بەدی بکرێت، بە تایبەتی ئەگەر پرۆژەکە پێکهێنانی دەوڵەت بێت، چونکە بڕوا ناکرێت کە هۆزێکی گەرۆك، خاوەن ژمارەیەکی کەم وتوانایەکی دیاری هەبێت، داوای دروست بوونی دەوڵەت بکات، چونکە وای دەوێت کەواتە دێینە سەر مەرجەکانی کە بریتین لە:

١٢-١-١. زەوی "الارض": مەبەست لە زەوی ئەو هەرێمە دەگرێتەوە وەیان ناوچەیەکی دیاری کراو لە زەوی، مەرج نی‌یە (درێژی یان پانی)یەکی دیاری کراوی هەبێت، یان جوگرافیاو ئاو هەوایەکی دیاری کراوی هەبێت.

هەندێ لایان وایە کە دەبێت لەو زەوی‌یەدا، یان ئەو هەرێمەی کە داوای مافی چارەی خۆنووسینی بۆ دەکەن، چەند مەرجێکی دیاری کراو وتایبەتی تێدا هەبێت، کە ئەویش مافی گەرانەوە یان پەیوەندییەکی توندیان بەو هەرێمەوە هەبێت، واتە دانیشتوانی رەسەنی ئەو شوێنە بن سەبارەت بە مەرجی‌تر هەندێك دەڵێن کە پێویستە روبەرێکی دیاری کراوی هەبیت، ئەمە جگە لە بوونی جوگرافیایەکی یەکگرتووی هەبێت..

## ١٢-١-٢ دانیشتوان:

دانیشتوان ئەو کۆمەڵە مرۆڤە (السکان) دەگرێتەوە، لە هەردوو رەگەزی نێرو مێ، گەورەو بچوك کە بۆ ماوەیەکی زۆر بەیەکەوە دەژین لە کۆمەڵگایەکدا، ئیتر مەرج نی‌یە هەمان رەنگیان هەبێت یان یەك رەگەزی یەکگرتوویان هەبێت، گرنگ ئەوەیە کە دانیشتوانێکی جێگیر بن، کۆچەر نەبن، وەناچار نەبن کە شوێنەکانیان

بەجێ بهێڵن، چونکە بۆ ژیان دەست نادات نابێت ژمارەیان ئەوەندە کەم بێت کە شارێکی بچوک پێك نەهێنن یان گوندێك پێك نەهێنن.

مەرجە لەو دانیشتوانەدا سیمای کۆمەڵگای سیاسی‌یان تێدا بەدی بکرێت، وەمەرجیشە کە نوێنەری سیاسی تایبەت بەخۆیان هەبێت..(٢٣)

مەرجە ئەو دانیشتوانە بیرو بۆچوونی سیاسی‌و تێگەیشتنەکانیان، لەو هەرێمەوە هەڵقوڵابێت. واتە لێرەدا مەبەست لە ئامانجە سیاسی‌و کۆمەلایەتی‌و رۆشنبیری‌و ئابووری‌یەکانە، کە دەبێت ئەمانە ئامانجی تایبەتی بن، بەو هەرێمەو بارودۆخی هەرێکەوە نەك ئامانجی گشتی کە تەنها گرنگی بەلایەنە مرۆییەکان بەگشتی دەدات.

### ١٢-١-٣.ویستی هاوبەش (الاراده المشترکه):

مەبەست لە هیواو ئاواتی هاوبەشە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵ پاشان رێکەوتن لەسەر چۆنیەتی جێبەجێ کردنی لە نیشتمانێکی یەکگرتوودا یان لە زۆربەی زۆرینەدا.

ئەم هیوایانەش بیرو بۆچوونی دانیشتوانە کە لە ژێر کاریگەری خاك، پاشان دروست بوونی کۆمەڵ، هۆی یەکگرتنیان بەهۆی بەرژەوەندی‌یەکانیانەوە کە کۆمەڵەکە لەسەری رێك کەوتوون، لێرەدا ویستەکانیان دەربڕینی خواست‌و ئارەزووەکانیان دەبێت، ئەو کۆمەڵە بەرەو کۆمەڵگایەکی سیاسی بەرەو پێش دەچێت.

ئالەم کاتەدا سیاسەت پرۆسەیەکی هاوسەنگی دەبێت لە نێوان دەسەڵاتی کۆمەڵ‌و سەربەستی تاکە کەسی‌دا، ئەوەی گرنگە لێرەدا کە دەبێت خواستێکی هاوبەش هەبێت کە ئەمیش خۆی لە خۆیدا بریتی‌یە لە بەدیهێنانی خۆی لە دیاری کردنی‌مافی چارەی خۆنووسین دا.

بەڵام بوونی ئەم ویستە لە شێوەی ئەم داواکارییەدا بەس نی‌یە، بەڵکو دەبێت پێش هەموو شتێك کۆمەل رازی بێت لە سپاردنی دەسەڵات بە کۆمەڵێکی‌تر. جا ئەگەر ئەم مەرجە هاتە دی ئەو کاتە دەوترێت کە ئەو کۆمەڵە بەرەو بەدی هێنانی بیری دروست کردنی دەوڵەت ئەرۆن.

## ١٢-١-٤. خەباتی یەکگرتووە (الکفاح الموحد):

ئەو کۆمەڵەی هەوڵ دەدات بۆ دیاری کردنی مافی چارەی‌خۆنووسین، پێویستە یەکەم هەوڵ، دەست بەسەر دەسەڵاتدا بگرێت، ئەمەش لە رێگەی کۆمەڵە خەڵکیکەوە یان حزبەکانەوە یان دەستەی نیشتمانی‌یەوە دەبێت، ئەم هەولانەش لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکی‌تر دەگۆرێت. لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەلێکی‌تر دەگۆرێت، بە پێ‌ی بارودۆخی ناوخۆو نێو دەوڵەتی. ئەم هۆیانەش دەتوانین بیانکەین بە دوو جۆرەوە:

یەکەم: هۆیەکی سیاسی ئاشتی پەروەری‌یە (مەبەست لەبەکار نەهێنانی چەکە): ئەمەش لە رێگەی کۆمەڵێکی سیاسی‌یەوە کە رێگەی دیموکراسیانە پەیرەو ئەکەن لە پێك هێنانی حزبو دەستەی سەندیکاکان، ئەمەش لە رێگەی کۆڕو کۆبونەوە کۆمەلایەتی‌یەکانو خۆپیشاندانو بلاو کراوەکانو لێدوانەکانیان، لە دوایدا لە رێگەی گفتوگۆ کردنەوە دەبێت. لە رێگەی ئەم هۆیانەوە هەوڵ دەدرێت بۆ گواستنەوەی دەسەلات بە شێوەیەکی سروشتیانە. دەبێت ئەوەش بزانرێت ئەم جۆرە تاقی کردنەوە هەڵبژاردەیەی گەل، پێویستی بە پلەیەکی بەرچاو لە هۆشیاری سیاسی دەبێت، وە رێکخستنی کۆمەلانی خەڵك بە هەموو چینو توێژەکانیانەوە. لە لایەکی‌تریشەوەدەبێت داوا لە دەسەلاتی بێگانە بکات لەبەکار هێنانی ئەم هۆیانە بۆ دەربرینی بۆچوونەکانو رێچکەکانیانو بلاو کردنەوەیانو رێگەدان بە سەربەستی تاكو کۆمەڵ.

دووەم: لە حاڵەتی نەبوونی ئەو  بارودۆخەی لەسەرەوە باسمان کرد، کۆمەڵ ناچار ئەبێت کە رێگەی تێکۆشانی چەکدارانە بگرێتە بەر، واتە پەنا بردنە بەر توندو تیژی. هەمیشە توندو تیژی هەر توندو تیژی بەدواوە دەبێت. شۆڕشی چەکداری لە هەرێمێکەوە بۆ هەرێمێکیتر لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکیتر بێگومان دەگۆڕێت، بەڵام هەرچۆنێك بێت هەموویان بانگهێشتی جەماوەر دەکەن بۆ جوڵاندنو بزواندنی جەماوەرو کەم کردنەوەی توانای دەسەڵاتی فەرمانڕەواوە پڕوپاگەندە کردن بۆی.

تێۆشانی چەکداری جیاواز هەیە لە "شۆڕشی جەماوەر -Mass-Insurrection هەروەها جیاوازی هەیە لەگەڵ (توندو تیژی گشتی-Molo-Violence) چونکە ئەمەی دواییان بۆ ماوەیەکی کاتییە، بەبێ پیلان دانانو چاودێری کردن روو دەدات.

شۆڕشی جەماوەر یان راپەڕین ئەمەیان هەرچەندە لە  تێکۆشانی چەکداریەوە نزیکە، وە پیلانی بۆ نەکێشراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا  لەوانەیە لە ئەنجامی بانگ هێشتن بێت بۆ تێکۆشانێکی چەکداری روو دەدات.

هەرچەندە مەرجی نییە لە هەموو بارودۆخێکدا  کە تێکۆشانی چەکداری، بە راپەرینێکی توندو تیژی سەرتاسەری کۆتایی بێت، وە لەسەر لایەنە سیاسییەکان پێویستە ئەو راستییە بزانن، کە دەبێت زۆر ئاگاداری نەك تەنها بەڵێنەکانیان بەڵکو کردەوەکانیان بن، وەجەخت لەسەر ئەوە بکەن  ئەوەی کە گەل پێش کەشی دەکات دوای گەیشتنیان بە دەسەڵات، ئەمە چاکترینو باشترین شێوازە وە زۆر زۆرترە لەوەی  کە دەسەڵاتی فەرمانڕەوا پێشکەشی بکات، وە هونەری تێکۆشان پێویستی زۆری بە خۆبەخشینو حەماسەتی زیاتر هەیە لە پێش هەموویانەوە چۆنیەتی بەدەست هێنانی بڕوای زۆرینەی خەڵکەکەیە بەلای خۆیدا..

## ١٢-١-٥ رای گشتیو پڕو پاگەندە (الرای العامو الدعایه)

پێویستە هەموو بزتنەوەیەکی رزگاریخواز، باش لە بۆچوونی رای گشتی ناوخۆو جیهانی تێگەیشتنیان بۆ مەسەلەکەی تێبگات، بۆ ئەوەی بتوانێت سۆزی جەماور بەلای خۆیدا رابکێشێت، بەڵام سەبارەت بە پروپاگەندە: بریتییە لە هونەری کارتێکردن لە خەڵکی لە رێگەی هەوڵدان بۆ قۆستنەوەی هەل لە نوێنەرایەتی کردنیاندا. بەهەمان شێوە ئەمیش بەم زاراوەیە پێشینەیەکی هەیە وە بەکار هێنراوە، بۆ مەبەستی سیاسیو بازرگانیو تەنانەت مەسەلە ئایینیەکانیش. هەروەك چۆن رۆمانەکان دژی (بربر)ەکان بەکاریان هێناوە. وە ئەڵمانیایەکان دژی (پاپاو کلێسای کاسۆلیك) بەکاریان هێناوە وەیان بە پێچەوانەشەوە.

پڕو پاگەندە زۆر جار کاریگەریەکی دیاری کراوی دەبێت وەیان دەبێتە هۆی گۆڕینی ژیانی تاکە کەسان تەنانەت کۆمەڵەکانیش. وەشێوازی بیرکردنەوەیان گۆرانێکی هەمەلایەن بەخۆوە دەبینێ. ئەو کاتە پڕو پاگەندە دەبێت بە پروپاگەندەیەکی شۆڕشگێڕانە، وە شارەزایانی پروپاگەندە دەڵێن: لەبەر ئەوەی مرۆڤ کە خۆی ناتوانێت بە تەنها لە رێی خۆیەوە هەموو شتەکان بزانێت. وە چ شتێك لە بەرژەوەندیدایە هەرچەندە دەوروبەرەکەی (بەڵگەدارە-مسب)وە یەکێك لەوانەی بونەتە هۆی پڕو پاگەندەیە. کە هەرچەندەناتوانرێت پێش بینی کۆتایی بکرێت. سەبارەت بە رووداوەکانی داهاتووش.

## ١٢-٢ کۆسپەکان (القیود)

ئەو کۆسپانەی کە مەسەلەی مافی چارەی خۆنووسین لە کار دەخات، وەیان تێکی دەدات، هەندێ جاریش بەو شێوە نابێت بەڵکو مەسەلەکە بە ئاشتیو بەبێ لەکار کەوتن کۆتایی دێت،. یەکێك لەو کۆسپانە یان بەندانە مەسەلەی کەمە

نەتەوایەتیەکانە، یان ئەو کەمینانەی کە دژی بۆچوونی مافی چارەی خۆنووسین دەوەستن یان داواکاری تایبەت بە خۆیان دەبێت، وەیان ئەوانەش داوای مافی چارەی خۆنووسین بۆ خۆیان دەکەن.

کەمە نەتەوایەتی: مەبەست لێ ی ئەو کۆمەڵە بچوکانە دەگرێتەوە کە ماف خوراون، بەڵام ئەو کۆمەڵە بچوکانە ناگرێتەوە هەرچەندە ژمارەشیان کەم بێت، زۆربەی جار ئەمانە یان فەرمانڕەوان یان خاوەن دەسەڵاتی بەهێزن.

مەسەلەی کەمینەکان ئەم زاراوەیە لە تێگەیشتنی تازەگەریدا سەرهەڵدانێکی بەرەو پێش چوونو تێگەیشتنی دیموکراسیەتە، وەیان سەروەری گەل یان زۆرینەیە.

یەکێك لە کێشە سەرەکیەکانی کەمینە نەتەوایەتیەکان لە رۆژانی ئێستاماندا، ئەوەیە سەرهەڵدانی کێشەی (زۆرینەی مافخوراوە)وە بێبەش کردنیان لە مافە سیاسییەکانیان، بەهۆی ناکۆکیەکانیان لەگەڵ وڵاتی دایکەدا کە جیا بونەتەوە لێ ی، بەهۆی هۆکاری سیاسیو مێژوویی لە ژێر ناوی گۆرانو گەشە پێدانی سیاسیدا، لە کاتی دروست بوونی دەوڵەتی تازەدا.

ئالەم کاتەدا زۆرینە بوون بە کەمینە. وە بە پێچەوانەشەوە کەمینە بوون بە زۆرینە، ئەم بۆچوونە گوێزرایەوە بۆ لایەنی فیکریو سیاسی، ئەوە بوو (هیگل) پاشان (مازیینیو نابلیۆنی سێیەم)دژی مەسەلەی نەتەوایەتی توند رەو وەستانو دژایەتی مافی کەمینەکانیان دەکرد.

سەبارەت بە یاسا نێو دەوڵەتیەکان بۆ پاراستنی مافی (کەمینەکان) ئەوە بوو پەیماننامەی ئۆسنابرك-Osnabruct-ساڵی ١٦٤٨ بەسترا، پاشان (پەیماننامەی بەرلین) ساڵی ١٨٧٨ بەسترا، وە چەندەها پەیماننامەیتر بۆ پاراستنی کەمینە مەسیحیو ئەوروپیەکان، بە تایبەتی لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە، هەروەها "کۆمەڵەی گەلان-عصبە الامم-" لە بڕیارەکانیدا ئاماژەی بۆ هەندێ لە مافە

شارستانی‌و سیاسیەکانی بۆ کەمینەکان کردووە، بەڵام نە ئەو پەیماننامانەو نە ئەوانەی دواتریش، باسیان لە سروشتی ئەرکەکانیان نەکردووە، سەبارەت بە پاراستنی مافەکانی کەمینەکان کە ئایا ئەوە مافێکی گشتی‌یە لەسەر ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکان وەیان تەنها ئەرکێکە کە پێویستە لەبەر چاو بگیرێت، بەڵام لێرەدا چەند هۆکارێك (عوامل) دێتە پێشەوە کە ڕۆڵی سەرەکیان هەیە؟ ئەوانەش بریتین لە:

**یەکەمیان.. هۆکاری سیاسی**

لێرەدا هەڵوێستی دەوڵەتە گەورەکان بە ئاشکرا روون دەبێتەوە بەرامبەر بە یەکتری، وەبەرامبەر بە مەسەلەکان، وە هەڵوێستی هەرێمایەتی‌و نێو دەوڵەتی بە شێوەیەکی گشتی.

لە ڕۆژگاری ئێستاماندا هەڵوێستی دەوڵەتە زلهێزەکان گرنگی خۆی هەیە، چونکە ئێستا سەردەمی پاراستنی هاوسەنگی‌یە لە نێوان زلهێزەکاندا لەبەر ئەوە هیچ یەکێك لەو دەوڵەتانە پاڵپشتی یان دژایەتی مەسەلەی مافی چارەی خۆنووسین ناکەن، تا بەرژەوەندییە باڵاکانی خۆیان ئەزانن کە ئایا ئەو جۆرە بڕیارە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیان دەگونجێت، وەبەشێك دەبێت لە ستراتیژی‌یە نێو دەوڵەتیەکان، پاش ئەمانە دێینە سەر مەسەلە مرۆڤایەتی‌و مەزهەبی‌و پرەنسیپەکان.

بەڵام لێرەدا دەبێت تێبینی ئەو بکرێت، کە هەموو کۆمەڵێك ئەگەر هاتوو داوای بکات وە ئەگەر هاتوو لە ناوچەیەکی دورە پەرێزدا بوو یان لە بۆشاییەکی سیاسی‌دا دەژیا، یان بەشێك بێت لە دەوڵەتێکی گەورە یان بچووك. مەرجەکانی مافی چارەی خۆنووسینی تێدا بەدی بکرێت، دەتوانێت داوای ئەم مافە ڕەوایەی خۆی بکات.

پاشان هۆکارێکی‌تر لە هۆکارە سیاسی‌یەکان ئەویش هەڵوێستی دەسەڵاتی فەرمانڕەواکانە، وەیان دەوڵەتی داگیرکەر ئەگەر هاتوو ئەو ناوچەیە داگیر کراو بێت بەرامبەر بە داواکارییەکانی دانیشتوان بۆ دیاری کردنی مافی چارەی خۆنووسین.

بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە بیرمان/ کە ئایا لە بەرژەوەندی ئەو دەسەڵاتە یان دەوڵەتەیە. کەواز لەو ناوچەیە بهێنن، یان ئایا ناچار دەبێت کە واز بهێنێت لەبەر هۆکاری ناوخۆیی لە ناوەوەی وڵاتەکەی‌دا یان هۆکاری نێو دەوڵەتی، کە کاریگەری بەهێزتری هەبێت کە دەتوانرێت بەرەنگاری بوەستێت، وەیان ئایا دەبێت بەرژەوەندی لەوەدا بێت بۆ رێکخستنەوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیەدا لەسەر بنەمای تازە.

پاشان ئەگەر ئەو مافەیان پێ‌بەخشین بەتەواوی دەبێت یان سەودای لەسەر دەکات یان تەنها بۆ لایەنی پروپاگەندە دەبێتو بەو شێوەیە نابێت کە خواستی خەڵکەکە دەیانەوێت، بۆ وەڵامی ئەم پرسیارانە دەڵێین کە ستراتیژی نێو دەوڵەتی‌و بەرژەوەندییە ئابووری‌یە باڵاکانیان، جۆری ئەو پەیوەندی‌یانە دیاری دەکەن ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی‌ترەوە بارودۆخی سیاسی ناوخۆیی کۆمەڵەکە کە داوای مافی چارەی خۆنووسین دەکەن کە گەورەترین کاریگەری هەیە لە رووی یەکبوونی بەرێوە بردنو یەکبوونی هەڵوێستو خەبات کردنیانەوە، وە ترسناکترین قۆناغ لە ژیانی ئەو کۆمەڵەیەدا، قۆناغی پێشبەدەست هێنانی مافی چارەی خۆنووسینە. چونکە حەز لێ کردنی دەسەڵاتو غەریزەی خۆ سەپاندنو شەهوەتی دەسەڵات بۆ بەدەست هێنانی کورسی فەرمانڕەوا. بەرچاویان تاریك دەکات کە بەرژەوەندی کۆمەڵەکە لە بیر بکەنو بەرژەوەندی دەسەلات لە سەرووی بەرژەوەندی ئەو کۆمەڵەوە دادەنێت.

ئەمانەش دەمانگەیەنێتە ئەو دەرئەنجامەی دەتوانین بڵێین کە مافی چارەی خۆنووسین، بە پرنسیپێکی سیاسی دادەنرێت. پێش هەموو شتێك دەچێتە ژێر

باری هۆکاره رامیارییەکانـەوە وە لـە ژێـر کاریگـەری‌دا دەبێـت زیـاتر لـە هۆکـاره یاسایی‌و مرۆییەکانەوە.

**دووەم.. هۆکاری ئابووری**

ئەمـەش بێگومـان کاریگـەری گـەورەی هەیـە، بـە تایبـەتی لـە پێـك هێنـانی دەوڵـەتدا وە چۆنیـەتی پاراسـتنی سـەربەخۆیی، وە نـهێنی باڵادەسـتی لـە رووی تواناکانیـەوە، پاشـان چۆنیـەتی پشـت بەسـتنی بـەو دەوڵەتانـەی کـە لـە دەوروبەری‌دان.

ئابووری ناسەکان سەردەمی گەشە کردنی ئابووری دەکەن بە سێ‌سەردەم:

سەردەمی یەکەم: پێش شۆڕشی فەرەنسا بوو شـێوازی بـاوی ئـابوری لـەو کاتـەدا کـاری بازرگـانی کـردن بـووە. کە هـەموو دەوڵـەتێك بـە هـەر شـێوەیەك بێـت گرنگی بـە خـۆی بـدات، وە دەسـکەوتی هـەبێت وە هیـچ رێگایـەك لـە شـەڕ باشـتر نەبووە بۆ دەست بەسەراگردتنی زەوی‌و زارو سەروەت‌و سامانی وڵاتانی تردا.

سـەردەمی دووەم: بـەکۆتایی شـەڕەکانی نـاپلیۆن دەسـت پێدەکـات، وەسەرەتای دەست پێکردنی (اعتباراتی) نێو دەوڵـەتی‌و نەتەوایەتیـەکان، جـۆرە هاوسەنگی‌یەکیان تێ کەوتبوو، لایەنی ئابووری تا دەهات بەرەو پێشەوە دەچوو، لە لایەکی ترەوەهەستی نەتەوایەتی‌و راپەڕینی نەتەوەکان لە گەشە کردندا بوون. بـە جۆرێـك لـە کۆمـەڵگا کراوەکـاندا گەیشـتە ئـەو رادەی کـە دەڵێـن: ئـەم تـۆوی نەتەوایەتی‌یە چینی بۆرجوا هێنایە ئاراوە نەك چینی زەحمەتکێش، چونکە ئەوان هـەموو جیـهان بـە ولاتـانی خۆیـان دەزانـن، گـەلانی ئـەورووپا دەگەڕانـەوە بـۆ مەسیحیەت‌و یاساکانی سروشت‌و شارستانێتی.

نەتەوە، بیرو بۆچونی نەتەوەیی زۆر بە زوویی لە لایان پەرەی سەندو گەیشتە پۆپە، پێش ئەوەی سەردەمی سێیەم دەست پێبکات.

سەردەمی سێیەم: سەردەمی هەڵوەشاندنەوەو لێک ترازاندنی ئیمپراتۆریەکان و سەردەمی سەرهەڵدانی دەوڵەتە بەهێزەکان بوو، لەم سەردەمەدا بوو کە ئەڵمانیا یاسا گومرگیەکانی خۆی سەپاند، و سەردەمی گەشە پێدانی پیشەسازی بوو، ەو یەکێك لەو گۆرانکارییە گەورانەی کە لەگەڵ خۆیدا هێنانی کۆچ کردنی دانیشتوان بۆ شارەکان و زیاد بوونی، چینی کرێکاران و زیاد بونی رێکخستنیان و هاتنە ناوەوەی رژێمی خوێندن. وە مافی هەڵبژاردنی گشتی بوو. ئەوەی بەلامانەوە گرنگە لێرەدا دروست بوونی دەوڵەتی تازەیە لەسەر بنەمای مافی چارەی خۆنووسین.

وە لەلایەنی ئابوورییەوە ئایا ئەو دەوڵەتە دەتوانێت پشت بە خۆی ببەستێت؟ وە چارەنووسی دوا رۆژی وڵاتەکەی دەست نیشان بکات؟ لەبەردەم هەموو کۆمەڵێکدا چەند رێبازیك هەیە بۆ ژیانی خۆی کە بیر لەوە بکاتەوە کام رێگا بگرێتە بەر یان ئەوەتا سەربەخۆییەکی تەواو رادەگەیەنێت ئەمە پاش دراسە کردنێکی ئابوریانەکە دەتوانێت بە تەواوی پشت بە توانا ناوخۆییەکانی خۆی ببەستێت وە بەشی دەکات، لە رووی زەوی و دانیشتوان و سەروەت و سامانیەوە. یان ئەوەتا بیر لەوە بکاتەوە کە یەکبوونی یان بچێتە پاڵ دراوسێیەکی گەورەی بەهێزو لەگەڵیدا یەك بگرێ لە رووی جوگرافیاوە کە یەك ئابوورییان هەبێت.

یان بۆچونی سێیەم ئەوەیە کە یەکبوونی بازرگانی و گومرگی و هاوکاری کردن رابگەیەنێت لە هەموو بوارەکاندا وەك هەوڵدانێکی سەرەتایی لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش.

## ١.كورتەيەك لە
## مێژووی گەشەکردنی کۆمەڵگای کوردەواری
## لە قۆناغی کۆیلایەتیو دەرەبەگایەتیدا

کوردستانی گەورە هەمیشە جەرگەی بەیەکدا دانی نەتەوەکانیتر بووە، وە جێگەی چاو تێبڕینی داگیرکەران بووە، وە دووچاری ژێر دەستەیی داگیر کەران بۆتەوە، بە درێژایی قۆناغەکانی کۆیلایەتیو دەرەبەگایەتی..

دەتوانین سەرەتایی دەسەڵاتی بێگانە بگەڕێنینەوە بۆ چاخی پێنجەمی پ.ز کە سیرس توانی ساڵی (٥٥٠پ.ز) ئەو مەملەکەتەی کە ناوی (میدیا) بوو کە مێژوو نوسەکان بە نیشتمانی رەسەنی کوردەکانی دادەنێن، لە ناو بەرێت. ئا بەم شێویە کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی (ئەخمینیەکان) پاشان گوێزرایەوە بۆ دەسەڵاتی یۆنانیەکان "ئەو کاتەی کە ئەسکەندەری گەورە" توانی "ئیمپراتۆریەتی ئەخمینیەکان" لەناو بەرێت ساڵی ٣٣٠پ.ز.

لەماوەی هەردوو سەدەکانی یەکەمو دووەمی پ.زدا ئەرمەنەکان توانیان دەست بەسەر وڵاتانی کوردەکاندا بگرن، تا ئەو کاتەی رۆمەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست، ئەم دەسەڵاتەیان بەردەوام بوو تا سەردەمی سێیەمی زاینی. پاشان دەسەڵاتی ئیمپراتۆیەتی ساسانیەکان لە کوردستاندا دەستی پیکرد. هەتا هاتنی ئیسلامەکان لە ساڵی ٦٤٠زاینیدا بەڵام راستیەك هەیە دەبێت ئاماژەی بۆ بکرێت. کە خێڵە کوردەکان هیچ کاتێك سەریان نەوی نەکردووە بۆ ئەم دەوڵەت یان ئەو دەوڵەتیتر بەشێوەیەکی بەردەوام، وە نەچوونەتە ژێر دەسەلاتێکی راستەقینەی داگیرکەران، بەڵکو زۆربەی جار سەربەخۆیی خۆیان پاراستووەچونکە هەمیشە چیاکان پاڵپشتیان بوون.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی مێژووی ئەمارەتە کوردیەکان، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە لەسەردەمە جیاوازو بۆ ماوەی زۆریش لە شوێنە جیاجیاکاندا، ئەمارەتی کوردی هەبوون وە خاوەن دەسەڵاتی خۆیان بوون، بۆ نمونە ئەمارەتی ئەردەلان دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٢٢٠زاینی هەر لە دروست بونیەوە بەسەربەخۆیی مایەوە تاکۆتایی سەدەی شانزدەیەم ١٥٧٢ی زایینی.

بەڵام دەبێت ئەو بوترێت کە مێژوو نە لە سەردەمی کۆیلایەتیو نە لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا لە کوردستاندا، بوونی دەوڵەتێکی کوردی سەرتاسەری بەخۆیەوە نەبینیوە، کە دەسەڵاتی بگەیەنێتە هەموو بەشەکانیتر.

بێگومان کوردستان بەهۆی ئەو شوێنە تایبەتیەی کە هەیبووە، لە نێوان دوو دەوڵەتی دژ بەیەك (ئێرانو دەوڵەتیعوسمانی ئەمانە یارمەتی، یان دروست بوونی ئەمارەتی بچووك بچووکانیان دەدا لە ولاتی کوردەکاندا. بەڵام بە مەرجێك لەژێر چاودێری خۆیاندا بن، واتە خۆیان ببەستنەوە بە شانەکانی ئێران یان سوڵتانەکانی عوسمانی..

سەرۆك خێڵەکانو سەرۆکی ئەمارەتەکان ئەو کاتە ئەوەیان بەلاوە گرنگ بووە، ئەو زەوییانەی کە پێیان دەبەخشرا لە لایەن شاو سوڵتانەکان دەیان کرد بە موڵکی خۆیان، بەم جۆرە (لە سەرۆك خێڵەوە) بۆ خاوەن زەوی (دەرەبەگ) گۆڕان.

سەرهەڵدانی پەیوەندی دەرەبەگایەتی لە کوردستندا لە نێوان هەردوو سەدەی دەیەمو یازدەیەمدا بووە بەڵام لوتکەی گەشە کردنی ئەم پەیوەندییە دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی نێوان شەڕەکانی ئێرانیو عوسمانییەکان. یەکێك لە هۆکارەکانی شەڕی ئێرانیو عوسمانیەکان چاو تێبڕینیان بووە لە خاکی کوردستان، وە ئەم داگیرکەرانە هەر لە ڕێگەی دەرەبەگو خاوەن زەوییەکانو ئەو سەرۆك خێڵانەی کە بەرژەوەندی میللەتەکانیان دەفرۆشت بەرامبەر بە سودی تایبەتی خۆیان، توانیان دەسەڵاتی خۆیان بسەپێننو ولاتەکەیان داگیر بکەن.

بەڵام سەرەرای ئەمانە زۆر لە دەسەڵات دارانی کوردی توانیان خۆیان بگرن بە رووی داگیرکەرانی کوردستاندا تا کۆتایی سەدەی حەڤدەیەم، لەوانە دەسەڵات یاخود یلێین حکومەتی یەزیدیەکان لە سنجارو (العليين) لە دیار بەکرو زازا لە دەرسیم. لە کۆتایی سەدەی هەرژدەیەم زۆر بزوتنەوەی کوردی پەیدا بوون کە ئامانجیان رزگار کردنو بەدیهێنانی خەونی دێرینی کورد لە دەوڵەتی کوردیدا بوو.

چەند ئەمارەتێك پەیدا بوون کە ئامانجیان سەربەخۆیی بوون بوو لە دەسەلاتی ئیمپراتۆیەتی عوسمان، یەکێك لەو ئەمارەتانە ئەمارەتی بابان بوو پاشان ئەمارەتی سۆران کە میری گەورە میر محەمەد سەربەخۆیی خۆی راگەیاند لە دەسەڵاتی والی عوسمانی لە بەغدا لە ساڵە ١٨٢٠دا.

وە لە ناوچەی جەزیرەدا بەدرخان پاشا ئەمارەتێکی کوردی دامەزراند لە ساڵی ١٨١٢دا، بەڵام هێزی داگیر کەری عوسمانی بێت یان ئێرانی توانیان بەهەر رێگایەك بێت ئەم ئەمارەتانە لەناو بەرن.

بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا نەتوانرا شۆڕشی کورد بۆ هەمیشەیی لەناو بەرن، هەرچەندە دەسەڵاتی عوسمانیو ئێرانی زۆر لە نەگبەتیو نەهامەتیو لەناو بردنیان بۆ جەماوەری کورد هێنا، کە دەیان ویست بە زەبری ئاگرو ئاسن بیان خەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە.

چەندەها جار هێرشی جۆراو جۆریان دەکردە سەریان، جارێك لە ژێر ناوی هەڵمەتی تەمێ کردندا، جارێ لە ژێر ناوی هەڵمەتی لەناوبردندا، رووباری خوێنیان لە کوردستاندا دەخوڵقاند.

لە کاتی شەڕی رووسو تورکەکاندا راپەڕینی کوردەکان لە "شەمدینان" بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدوڵڵای نەهری ساڵی ١٨٨٠دا دەستی پێکرد. کە داوای

بەدیهێنانی سەربەخۆ بوونی دەکرد کە لە ژێر چاودێری ئیمپراتۆیەتی عوسمانی‌دا بێت.

بەڵام ئەم راپەرینەش سەری نەگرت‌و وەك ئەوانی‌تر سەرکوت کرا. لە بەهاری ساڵی ١٩٠٥دا شۆڕشی کوردی بە سەرۆکایەتی (جەعفەری شکاك-سمکۆ) لە رۆژهەلاتی کوردستاندا دەستی پی‌کرد، کە ئەمیش ئامانجی رزگار کردنی کوردستان بووە پاشان لە باشووری کوردستان لە ناوچەی بارزان بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدولسەلام بارزانی شۆڕشی کورد دەستی پێکرد.

سەبارەت بە باکوری کوردستان بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد، شان بە شانی بزوتنەوەی رزگاریخوازی تورکی کاریان دەکرد، کە داوای چاکسازی دەستوریان دەکرد، کە زیاتر ئەو کاتە لە ژێر کاریگەری (جمعیه التحاد الترقی) تورکی‌دا بوون چونکە بڕوایان وابوو سەرکەوتنیان هاوبەش دەبێت وەدەتوانن ئامانجەکانیان بهێننە دی، وە نەك هەر کود، بەڵکو عەرەب‌و ئەلبان‌و ئەرمەنیش بەشداری خەباتیان دەکرد لەگەڵ کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی‌دا.

بەڵام هەر زوو ئامانجە شۆڤێنیەکانی سەرکردەکانی ئەم رێکخراوە دەرکەوت، بە تایبەتی هەر دوای گرتنە دەستی کورسی دەسەڵات، لە ئەنجامی کودەتای ساڵی ١٩٠٨دا کە بووە هۆی کشانەوەی زۆرینەی کوردەکان وە زۆربەی نەتەوەکانی تریش کەوتنە خۆیان بۆ دامەزراندنی رێکخراوی تایبەت بە خۆیان ئابەم جۆرە کوردەکان ئەندامە کۆنەکانی (جمعیە الاتحاد والترقی) کۆمەڵەیەکی تایبەت بە خۆیان پێك هێنا لەژێر ناوی (جمعیە نعالی وترقی کردستان)، هەروەها لە ساڵی ١٩١٠دا "(جمعیه هیوا) دامەزرا لە ساڵی ١٩٠٨دا کۆمەڵەی (نشر المعارف) بڵاوکردنەوەی زانیاری کوردی دامەزرا. وە لە قاهرە کۆمەڵەی سەربەخۆ بوونی کوردی دامەزرا.

ئەمە جگە لە کۆمەڵەی "تعالی کردستان" هەروەها (تشکیلات الاجتماعیە الکردستانیە)و "حزب الامە کردی" وە ڕێکخراوی جهاندانی لە ڕۆژهەلاتی کوردستاندا لە ساڵی ١٩١٣دا پەید بوون.

وە چەندەهای تریش کە کاریگەری گەورەیان لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری سیاسیو نەتەوەیی گەلی کوردا هەبووە.

وەکاریان دەکرد لە ڕێگەی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی کە دەریان دەکرد لەوانە:

هیوای کورد–ڕۆژی کورد–هەتاوی کورد–یەك بوون–ژین–کوردستان–...هەتا دوایی.

## ٢.کێشەی کورد
## لەژێر سێبەری پەیوەندیو پەیماننامە نێو دەوڵەتیەکاندا
## لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە

جەنگی جیهانی یەکەم، بووە هۆی دابەشکردنێکی تازەی توانای کۆلۆنیالی دەوڵەتە زلهێزەکان لە جیهاندا، وە پاش سەرکەوتنی دەوڵەتە داگیرکەرەکان دەستیان بەسەر سەروەتو سامانی لایەنی دۆراودا گرت.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یەکێك بوو (لەو لایەنە) دۆراوانە هەر زوو پەلاماریان دا. کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس ساڵی ١٩١٩ و پاش ئەویش هەموو ئەو پەیماننامانەیتر، کە دەبەستران خەریکی داڕشتنەوەی پرۆسەی دابەشکردنێکی نوێ بوون لە نێوان خۆیاندا.

شوێنی کوردستان کە گرنگیەکی تایبەتی هەبوو وەناوەندی ڕۆژهەلاتی ناوەراست بوو وەبەشێك بوو لەو ئیمپراتۆرە گەورەیە، کەلە سەردەمی

عوسمانیەکاندا بە ولایەتی موسڵ دەناسرا، کە بریتی بوو لە لیواکانی موسڵ، هەولێر، سلێمانی‌و کەرکوکی ئێستای دەگرتەوە..

ئەمە سەرەرای دەوڵەمەندی کوردستان لە سامانی کانزاییدا وە بە تایبەتی "نەوت" بووە هۆی ئەوەی ناکۆکیەکان بەهێزتر بێت لە نێوان هێزە داگیرکەرەکاندا بۆ دەست بەسەراگرتنی ئەو ناوچانە، سەرەتای دزەکردنی ئینگلیزەکان بۆ کوردستان بۆ سێیەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم دەگەرێتەوە پاشان رۆڵی فەرەنسی‌و رووسی‌و ئەڵمانی‌و ئەمریکایەکان دێت، ئینگلیزو فەرەنساییەکان ناکۆکی لە نێوانیاندا تا دەهات توندتر دەبوو، لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی میراتی عوسمانیەکان. بە تایبەتی لەسەر ویلایەتی موسڵ.

کاتێك دەوڵەتە کۆلۆنیاڵەکان پەیماننامەی "سیڤەر"یان بەست لەگەل ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا وە چەند بەندێکی تێدایە سەبارەت بە مافە سەرەتاییەکانی گەلی کورد. دەتوانین ئەمە بە سەرەتای سەرهەڵدانی مەسەلەی کورد دابنێین لە گۆرەپانی سیاسەتی نێو دەوڵەتیدا، کە لە ئاستی پەیوەندییە هاوچەرخە نێو دەوڵەتیەکاندا بێت، بە تایبەتی لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەم دەستی پێکرد. کێشەی کورد ئەو کاتە بە کێشەیەکی لاوەکی دادەنرا بە نسبەت دەوڵەتانی رۆژهەلاتی ناوەراستەوە.

وەهۆکارەکەشی دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە گوایا ئەم مەسەلەیە یەکێکە لە کێشە ناوخۆییەکانی هەموو ناوچەیەك لە ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، وە لە لایەکی‌ترەوە دۆزینەوەی چارەسەری عادیلانە بۆ ئەم مەسەلەیە، لەگەڵ بەرژەوەندی زلهێزەکاندا نەدەگونجا لە ناوچەکەدا.

بەڵام پاش کۆتایی هاتنی جەنگەکە جارێکی‌تر کێشەی کورد هاتەوە سەر گۆرەپانی سیاسەت، وەك یەکێك لە کێشە هەلواسراوەکان کە پێویستە چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك لەوانە:

١.سەرهەڵدانی بیرو بۆچوونی نەتەوەیی لە نێوان تورك‌و فارس‌و عەرەب‌و کورددا بە تایبەت لە نێوان هەمو گەلە ژێر دەست‌و چەوساوەکاندا کە ئامانجیان پێك هێنانی دەوڵەت بوو.

٢.دەنگدانەوەی شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستی لە هەموو جیهاندا.

٣.رەنگدانەوەی راگەیاندنی رەسمی سەرۆکی ئەمەریکا بە تایبەتی، بەندی (١٢)کە دان پیا نانە بە مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەکان بە تایبەتی ئەوانەی لەژێر رکێفی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌دا بوون.

٤.دژایەتی کردنی مەسەلەی داگیر کردنی کۆلۆنیاڵی لە لایەن دەوڵەتانەوە.

٥.دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلان-عصبە الامم- وەك رێکخراوێکی نێو دەوڵەتی کە دەورێکی ئیجابیانەی هەبووە، لە پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکاندا.

هەموو ئەم بارودۆخانەی کە هاتەپێش لە پەیوەندییە نێو دەوڵەتیەکان بۆ چارەسەر کردنی مەسەلە گرنگەکانی ناوچەکە. کوردەکان ئاواتیان ئەوە بوو کە کێشەکەیان چارەسەر دەکرێت.

بەڵام ئەوانەی کە روویان دا، پێچەوانەی ئەوانە بوو کە باسیان لێوە دەکرد، مەسەلەی کورد بەڵکو هەر لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمەوە، بابەتی رێکەوتنە نهێنیەکانی دەوڵەتە زلهێزەکان بووە بە تایبەتی لە نێوان بەریتانیاو فەرەنساو روسیا. کەمافی بە بەریتانیادا مافی داگیر کردنی بەشی رۆژهەڵاتی کوردستانی هەبێت. وە لە ساڵی ١٩١٦دا وتووێژی نهێنی کرا لە لەندەن لە نێوان بەریتانیاو فەرەنسادا، سەبارەت بە دابەشکردنی زەوییەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی واتا دابەشکردنی کوردستان‌و ئەرمینیا، بەپێی رێکەوتننامەی مێژوویی کە بە پەیماننامەی (سایکس بیکۆ) ناسراوە، وە جێبەجێ کردنی ئەم نهێنی‌یە لە پەیماننامەی لۆزاندا هاتە دی.

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا بە تایبەتی دوای کۆتایی هێنانی جەنگی جیهانی یەکەم گەورەترین هەل لەبەردەم کوردا پەیدا بوو، وەیان بە شێوەیەکی‌تر هەموو پێداویستیەکانی دروست بوونی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لە ئارادا بوون، بزوتنەوە رزگاریخوازە نیشتمانیەکان داوای دامەزراندنی، دەوڵەتێکی کوردیان دەکرد کە هەموو کوردستان بگرێتەوە. ئەمە جگە لەوەی لەگەڵ خواست‌و ئامانج‌و حەزەکانی گەلی کورد دا دەگونجا. سەرەرای ئەوەی ئەم داواکارییە داواکارییەکی زۆر واقع بینانە بوون، وە مافێکی رەوای گەلی کورد بوون، چونکە هەر دوای تەواو بوونی جەنگی جیهانی، یەکەم، داواکاری هەموو بزوتنەوە رزگایخوازە نیشتمانی‌یەکانی گەلانی تری وەك ئەرمەن‌و عەرەب بوو کە داوای دامەزراندنی دەوڵەتی نیشتمانی خۆیان دەکرد، کە هەموو نوێنەریان نارد بۆ "کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس". وە بە هەمان شێوە گەلی کوردیش لە رێی هەندێ لە بزوتنەوە کوردییەکان نوێنەری خۆیان نارد بۆ ئەوەی داوای دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی بکەن.(٣١)

بەڵام بە داخەوە گەلی کورد لە مافی خۆی بێبەش کرا، وە هۆکەشی بەهۆی "سەودا-مساومە" کردنی دەوڵەتە داگیرکەرەکان لە نێوان خۆیاندا لەسەر حسابی بەرژەوەندی گەلانی‌تر ئەوبش گەلی کورد بوو، کە بووە قۆچی قوربانی وە نیشتمانەکەیان دابەش کرد بۆ پێك هێنانی چەند دەوڵەتێکی عەرەبی، کە لە ژێر سێبەری داگیرکەرانی بەریتنی‌و فەرەنسی‌دا بن. ئابەم شێوەیە مەسەلەکە زۆر ئاڵۆز بوو وە تایبەتمەندی خۆی پەیدا کرد ئەویش:

یەکەم: کوردستانیان دابەشکردە سەر سێ دەوڵەتی رۆژهەڵاتی ناوەراست کە تورکیا و ئێران‌و عێراقە.

دووەم: لەبەر بەرژەوەندییە ستراتیجیە گەورەکانی داگیرکەران بە تایبەتی لە کوردستاندا کە بە بیرە نەوتەکان دەوڵەمەندە وە لە هەمووی گرنگ تر بوونی

یەکێتی سۆڤیەتی جاران وەك لە دەوڵەتیکی بەهێزو سۆشیالیستی، کە کوردستان هێڵی جیاکەرەوەی گەلانی سۆڤیەتی لەگەڵ تورکیاو ئێرانو دەوڵەتە عەرەبییەکان، جیا دەکردەوە.

سێیەم:نەگبەتی کورد لەوەدا بوو کە داگیر کەرانی تازەی کوردستان خۆیان وڵاتی داگیر کراو بوون گەلانی ئەو وڵاتانەی بە دەست داگیرکەرانو رژێمی دەرەبەگایەتی‌یەوە، دەیان ناڵاند.

کە واتە لێرەدا هەمان کێشە خۆی دووبارە دەکاتەوە، واتە مەسەلەیەکی هاوبەش هەیە لە نێوانیاندا مەسەلەی رزگار کردنی تەواوی هەموو گەلانی ئەو وڵاتانە بە کوردیشەوە لە دەسەڵاتی داگیرکەرانو دەسەڵاتی دیکتاتۆریو کۆنە پەرستانەی حکومەتە ناوەندییەکان.

هەرچۆنێك بێت بێبەش کردنی گەلی کورد لە مافە رەواکانی بە پلەی یەکەم دەکەوێتە ئەستۆی سیاسەتی کۆلۆنیالیزمی "ئەنگلو-فەرەنسی" وپاشان دەسەڵاتە کۆنە پەرستەکانی تورکیاو ئێرانو عێراقو سوریا.(٣٢) وەئەستۆی ئەوانە کە خیانەتیان لە نەتەوەکەیان کرد.

# ٣.مافی چارەی خۆنووسینی کورد لە پەیماننامی نێو دەوڵەتیەکاندا

پاش کۆتایی هێنانی جەنگی جیهانی یەکەم، و سەرکەوتنی هاوپەیمنەکان کوردەکان کەوتنە خۆیان کە زانیان هاوپەیمانەکان دەیانەوێت دەوڵەتێکی ئەرمەنی دروست بکەن کە سنورەکەی لە کەنارەکانی دەریای قەزوینەو دەست پێدەکات بۆ کەنارەکانی دەریای رەش، وە بەرەو رۆژئاواو خوار دەبێتەوە تا دەگاتە دەریای

ناوەراست، ئەم دەوڵەتە بریتی بوو لە ولایەتەکانی "تەرابزون، ئەرەزرۆم، وان، تەبلیس، دیاربەکر" کە زۆرینەی دانیشتوانەکانی کوردن.

لەبەر ئەوە حزب و ڕێکحراوە کوردیەکانی ئەو کاتە کە لە ئەستانبۆل هەبوون، بە هاوکاری نەوەکانی بەدرخان، کە هاوپەیمانەکان رازی بکەن بۆ یەککگرتنی ناوچە کوردیەکان و پێبەخشینی ئۆتۆنۆمی پێیان. کوردەکان بە نوێنەری "جەنەراڵ شەریف پاشا" لەگەڵ نوێنەری ئەرمەنەکان "بوغض نوبار پاشا"لە کۆنگرەی ئاشتی گەیشتنە ئەو ڕێکەوتنەی کە پێویستە بۆ دروست کردنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆی جیاواز لەو دەوڵەتە ئەرمەنیەی کە دەیانەوێت پێکی بهێنن وە ئەنجومەن بە شێوەیەکی مەبدەئیانە رازی بوو لەسەر ئەم جۆرە بۆ چوونە.(٣٤)

نوێنەری هاوپەیمانەکان پەیماننامەی سیڤەریان ئیمزا کرد.(٣٥) لە ١٩٢٠/٨/١٠، کە بە پێی ئەو پەیماننامەیە دامەزراندنی حکومەتی ئەرمەنیەکان لە ولایەتەکانی (تەرابزۆن–ئەرەزرۆم–وان و تەبلیس) بگرێتەوە، ئەمەش لە مادەکانی (٨هەتا ٩٣)دا ئاماژەی بۆ دەکات بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە کوردەوە هەبێت دامەزراندنی جۆرە ئۆتۆنۆمیەکە بۆیان لە ناوچە کورد نشینەکاندا.

پاڵپێوەنەری سەرەکی هاوپەیمانەکان، ئەوە نەبێت کە ئارەزوو بکەن لە بەدیهێنانی خواستە رەواکانی گەلی کورد، بەڵکو ئەوان، ئامانج و مەبەستی تایبەتی خۆیان هەبووە، هەروك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد لەبەر بوونی یەکێتی سۆڤیەت واتە بۆ وەستاندنی کاریگەری شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەسەر گەلانی چەوساوەی رۆژهەلاتی ناوەراست. بە تیبەتی لەسەر گەلی کورد. چونکە تێکۆشانی گەلی تا دەهات گڕو کڵپەی بەتین تر دەبوو بۆ پێك هێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی تایبەت بەخۆیان.

ئەمە لە کاتێکدا کە دامەزراندنی لەو جۆرە دەوڵەتە (خرابووە روو) لە مەیدانی نێو دەوڵەتی‌دا، ئەمە وای لە کۆلۆنیالیزمەکان کرد کە بکەونە خۆیان بۆ بەرەنگار

بونەوەی ئەو جۆرە تێکۆشانەی بە هێنانەکایەی یان داپۆشینی بە باس کردنی ئەو مادانەی کە پەیوەندی بە کوردەوە هەبووە.

ئەمە لە لایەکەوە وە لە لایەکیتریشەوە ئینگلیزو فەرەنسی‌یەکان دژی بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی شۆڕشی کەمالیەکان دەوستان، و دەیانویست کوردەکان بەلای خۆیاندا رابکێشن، چونکە کوردەکان سەلماندیان کە پەیوەندی‌یەکی بەهێزیان بە شۆڕشی کەمالیەکانەوە هەیە، وتوانیویانە رۆڵی سەرەکی ببینن دژی بێگانە.

لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە دەبێت بوترێت غەدر لێ کردنی ئینگلیزەکان لەوەدا بوو، دەیان زانی کە هیچ بڕگەیەك لەو بەندانە-(مادانە)ی کە پەیوەندی بە کوردەوە هەیە نایەتە دی، وە خۆشیان نایهێننە دی. لەبەر ئەوە دڵنیا بوون بە روخانی دەسەڵاتی عوسمانی لە ژێر زەبری کەمالیەکاندا، سیڤەریش لەگەڵ خۆیدا دەنێتە گۆڕو نامێنێت، بە نەمانی دەسەڵاتی عوسمانی، پەیماننامەش نامێنێت، لەبەر ئەوە هیچ ترسێکیان لەو بەندانەی پەیمانەکە نەبووە..

بەڵام ئەمە. ئەوە ناگەیەنیت کە ئەو بەندانەی پەیماننامەکە هیچ گرنگیەکیان نەبووە، بەڵکو بە پێچەوانەوە رەنگدانەوەیەکی کاریگەری هەبوو لەسەر بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورد. ئەمە جگە لەوەی بەیەکەم بەڵگەنامەی نێو دەوڵەتی دادەنرێت کە باس لەو جۆرە مافانە دەکات بۆ گەلی کورد. هەروەها بە یەکەم بەڵگەنامەی دیبلۆماسی دادەنرێت کە باس لە مەسەلەی کورد دەکات، بە شێوەیەکی رەسمی لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتیدا..(٣٦)

ئەگەرچی پەیماننامەی سیڤەر لە رووی مێژووییەوە یەکەم بەڵگەنامەی نێو دەوڵەتیە کە باسی چارەنوسی کورد بکات، بەڵام لەهەمان کاتدا سیڤەر کوردستانی بەجۆرێکیتر دابەش کردووە، بۆیە ئۆتۆنۆمیش لە سیڤەرداو لە دوای ئەویش

باسی هاته ئاراوه. چونکه دابەشکردنی کوردستان له روی یاساییەوه ئەوه دەخوازێ...(٣٧)

پەیماننامەی سیڤەر که له نێوان حکومەتی سوڵتانی تورکیا له لایەكو بەریتانیاو فەرەنساو ئیتاڵیاو یابانو ئەرمینیای تاشناقەکانو بەلجیکاو یۆنانو پۆڵۆنیاو پورتوگالو رۆمانیاو سربو کرواتو جیبازو چیکۆسلۆفاکیا. له لایەکیترەوە ئیمزا کرا. ئەم پەیماننامەیە هەڵوێستی سیاسیو یاسایی وڵاته سەرکەوتووەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی بەرامبەر به تورکیای عوسمانی دیاری دەکرد.

بەندەکانی "٦٢-٦٣-٦٤" له پەیمانی سیڤەر باس له رەوشی کوردان دەکات، جگه له چەند بەندێکیتر که پەیوەندی هەر به کوردەوە هەیە، ئەوەی پێویسته ئاماژەی بۆ بکەین که بەندەکانی (٦٢-٦٣-٦٤) تایبەته به مافەکانی گەلی کورد له باکور واته (کوردەکانی تورکیا) بۆ سەربەخۆ بوون له تورکیا بەم شێوەیه بوو..

مادەی ٦٢: کۆمسیۆنی قوستەنتینه که له سێ ئەندام پێك دێت پرۆژەی ئۆتۆنۆمی پێشکەش دەکات، که لەلایەن حکومەتەکانی بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیا دیاری کراون، سەبارەت بەو ناوچانەی که زۆرینەی کوردن که دەکەوێته رۆژهەڵاتی فوراتو باشوری سنوری ئەرمینیاوه باکوری تورکیایه لەگەڵ سوریاو میسۆپۆتامیا هەروەك چۆن له مادەی (٢٧)بەشی دووەم (٢،٣)دا دیاری کراون، وه له حاڵەتی دەست نەهێنانی کۆی راکان لەسەر ئەم مەسەلەیه کێشەکه دەگەڕێتەوە بۆ هەرسی حکومەتەکان...*

ئەم پرۆژەیه دڵنیایی پاراستنی ئاسورییەکانو کلدانیەکانو کەمه نەتەوایەتیەکانی ئایینیو نەتەوەییەکانیتر مسۆگەر دەکات لەم ناوچانەدا، بۆ ئەم مەبەسته کۆمیسیۆنێك پێك دێت له نوێنەرانی بەریتانیو فەرەنسیو ئیتاڵیو

فارسیو کوردی سەردانی ئەو شوێنانە دەکەنو دەیپشکننو بڕیاری گۆڕانکاری دەدەن لە کاتی پێویستدا لەسەر سنوری تورکی کە هاوسنورە لەگەڵ سنوری فارسەکان بەپێی بەندەکانی ئەم پەیماننامەیە..(٣٨)

مادەی ٦٣: دەوڵەتی عوسمانی پابەند دەکات بە جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی ئەو کۆمیتانەی کە لە مادەی ٦٢دا باسیان کراوە لە ماوەی ٣مانگدا بە گەیشتنیان لەلای ئەو حکومەتانە..

مادەی ٦٤: قەبارەی دیاری کردنی چارەنوسی گەلی کورد فراوانتر دەکات بەڵام لەژێر چەند مەرجێکدا وەك دەڵێت: ئەگەر گەلی کورد بڕیاریدا لەو ناوچانەی کە لە مادەی ٦٢دا دیاری کراون لەماوەی ساڵێکدا. لە دوای بەکارخستنی ئەم پەیماننامەیە بیانەوێت جیا ببنەوە لە تورکیا، وە ئەگەر ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان

بۆیان دەرکەوت ئەو گەلە دەتوانن خۆیان بەرێو بەرنو توانای ئەو سەربەخۆییان هەیە ئەوا ئەنجومەن پێشنیاری ئەو پێکهاتنەی بۆ کردن، ئەو کاتە تورکیا پابەندە بە پەسەند کردنی ئەو پێشنیارە، وە دەبێت دەست لە هەموو مافێکی هەڵبگرێ لەو ناوچانەد. وە ئەمەش بە پەیماننامەیەك دەبێت کە تورکیا لەگەڵ وڵاتە هاوپەیمانە سەرەکیەکاندا دیاری دەکات. وە ئەگەر تورکیا دەستی هەڵگرت ئەوا وڵاتە هاوپەیمانەسەرەکیەکان دژی ئەوە نین کە کوردەکانی ئەو بەشەی کوردستان کە لە ویلایەتی موسڵدان بە ئارەزووی خۆیان بچنە پاڵ ئەو دەوڵەتە سەربەخۆییە کوردیەوە.

دکتۆر مارف عومەرگوڵ لە نوسینەکەی لەسەر پەیمانی سیڤەر دەڵێت: ئەو هەموو مەرجانە "مەبەست لە مەرجەکانی مادەی ٦٤" لەگەڵ حوکمی یاسای تازەی نێو دەوڵەتاندا ناگونجێ "کەپرەنسیپی مافی دیاری کردنی چارەنووسی بۆ هەموو گەلان بە بێ جیاوازی دیاری کردووە، بەڵام لە سەردەمی خۆیدا دان پێدا نانێکی

یاسایی جیهانی‌یە بە کەسایەتی یاسای نێو نەتەوەیی کورد ئەگەر لە ژێر کۆنترۆڵی وڵاتانی تریشدا بێت.

سەرەڕای ئەو دان پێدا نانە، پەیماننامەی سیڤەر دابەشکردنی تازەی نیشتمانی کوردەکان بوو چونکە بە هیچ جۆرێك باسی رۆژئاوای کوردستان ناکات کە فەرەنسیەکان داگیر یان کردووە، پاشان بە سوریاوە لکێندرا.

لە لایەکی‌ترەوە دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە مادەکانی (٢٢،٨٩،٩٤) تایبەتن بە سنورەکانی تورکیاو پێکهێنانی دەوڵەتی ئەرمەنستان‌و سوریا و میسۆپۆتامیا، سنوری ئەم سێ وڵاتەش "تورکیا، سوریا، میسۆپۆتامیا، ئێران" خاکی کوردستانیان بەر دەکەوێت..(٣٩)

## ٤.سیاسەتی وڵاتە زلهێزەکان دەربارەی مەسەلەی کورد بە گشتی‌و ویلایەتی موسڵ بەتایبەتی

بەرژەوەندی دەوڵەتە گەورەکان لەگەڵ پێك هێنانی دەوڵەتی کوردی‌دا نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە کاریان دەکرد بۆ رێگرتن لە پێك هێنانی دەوڵەتی کوردی‌دا.

ئەگەر سەرنج بدەین لە مادەکانی پەیماننامەی سیڤەر ئەو راستیە بەرجەستە دەکەین. ئەوەتا مادەی (٢٧)سنوری نێوان (تورکیا، سوریا)و (تورکیا، میسۆپۆتامیا) دیاری دەکات، وەك دەزانین کە سنوری تورکیا لەگەڵ ئەو دوو وڵاتەدا لە هەر دوو لاوە کوردستان دەبڕێ‌و دەبێتە سێ‌بەش هەر لەبەر ئەمەیە کە مادەی "٦٢" ئۆتۆنۆمی ناوخۆیی‌دەکاتە چارەسەری مەسەلەی کورد.

ئەمە لەلایەکەوە، لە لایەکی‌ترەوە رێگە دەدات بە دروست بوونی دەوڵەتی کوردی لە ژێر کۆمەڵێ مەرجدا، خۆیان دەیان توانی راستەوخۆ سەربەخۆیی دەوڵەتی کوردی بەبێ ئەو مەرجانە رابگەیەنن هەروەك دەوڵەتی

سوریا وعێراق..(٤٠). که راستەوخۆ راگەیەنرا کە سەربەخۆن، چونکە پرۆسەی پێک هێنانی ئەو دوو دەوڵەتەو بەهەمان شێوەش سەربەخۆیی حیجاز لە بەرژەوەندی فەرەنساو ئینگلتەرەدا سەرچاوەیان دەگرت.

بە یانامەی ئەنگلۆ فەرەنسی لە ١٩١٨/١١/٨دا، ئەو راستیەی سەلماند کە هەردوولا بڕیار دەدەن حکومەت و دەزگای بەرێوەبردن لە سوریاو میسۆپۆتامیا (عێراقی تازە دروست بوو) کە لەلایەن وڵاتە هاوپەیمانەکانەوە لە چنگی عوسمانی رزگار کراون پێک بهێنن.

هەر چۆنێک بێت پەیماننامەی سیڤەر، هاوکات لەگەڵ دابەش کردنی کوردستاندا چارەنووسی کوردی لە شێوەی ئۆتۆنۆمی لە چوار چێوەی تورکیادا دیاری کرد.. لەگەڵ ئەمانەشدا دەڵێین مادەی "٦٤" دان پای نانێکی راستەقینە بوو بە بوونی گەلی کوردو مافی رەوای خۆیەتی لە دیاری کردنی چارەنوسیدا، هەتا ئەگەر لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمیشدا بێت، چونکە دەتوانین داوای سەربەخۆیی خۆی بکات. وە مافی دیاری کردنی چارەنووسی هەبێت لە دیاری کردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیادا، وە تەنانەت یەکگرتنەوەشی لەگەڵ ویلایەتی موسڵدا.

گرنگی پەیماننامەکە لەوەدایە کە دۆزینەوەی چارەسەری عەمەلیانەی بۆ مەسەلەی کورد دیاری کردووە، لەسەر ئاستی نێو دەوڵەتیدا. چارەسەرەکەشی یان بە ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی تەواوەتییە.

وە هەموویان ئەو راستیە زەقە بەرجەستە دەکەن کە گەلی کورد یەکێکە لەو نەتەوانەی کە مافی ژیان و بوونی هەیە. و ناتوانێت ناسنامەی نەتەوەیی لێ بسەنرێتەوە، هەر دەبێت خاوەن سەربەخۆیی خۆیی بێت ئەوەش مەسەلەی درەنگ و زوییی کەوتووە.

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر پەیماننامەی سیڤەر، بۆچی کاری پێنەکراو نەکەوتە کار، دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ گەلێك هۆکاری تایبەت لەوانەش:

یەکەم: لەبەر سیاسەتی کۆلۆنیالیانەی فەرەنساو ئینگلیزەکان، وە بە بوونی بەرژەوەندییە باڵاکانیان لە ناوچەکەدا.

دووەم: نە بوونیڕێکخراوێکی یەکگرتووی یەك هەڵوێستی کوردی، کە سەرتاسەری کوردستان بگرێتەوە، وە درك نەکردنیان بە لێپرسراوێتی مێژوویی‌و چارەنووسی گەلەکەیان بە پێی پێویست.

سێیەم: سیاسەتی تورکیای کەماڵ‌و روسیای سۆڤیەت، کە حکومەتی سۆڤیەتی ئەوسا بە هەموو شێوەیەك پشتگیری لە سەربەخۆیی تورکیاو سنورەکەی دەکرد بەپێی ئەو ڕێکەوتنامەی لە نێوانیاندا هەبوو، وە سنورە تازەکەی تورکیا کە ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی تورك نەخشەی بۆ کێشا بوو کوردستانیشی لەگەڵدا بوو، وە تەنها بۆ جوانکردنی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا، یەکێك لە پرەنسیپەکانی سیاسەتی دەرەوەی داننان بوو بە کەمە نەتەوەکانی تردا، لە چوار چێوەی تورکیادا بە گوێرەی خاڵی (دووەم، پێنجەم) کورد یەکێك بوو لەو کەمینانەی ناو تورکیا، وەك ئاشکرایە مەسەلەی کەمینەش لە چوارچێوەی هەر وڵاتێکدا بێت، مەسەلەیەکی ناوخۆی وڵاتەکە خۆیەتی، کەواتە ئەمە واپیشان دەدات کە کورد لە تورکیا گەلێکی سەربەخۆ نییە.

کەواتە ڕێکەوتنامەی نێوان تورکیاو روسیا لە لایەك رەتکردنەوەی پەیماننامەی سیڤەر بوو، لە لایەکیتریشەوە داننانە بە سنوری تورکیا بە باکوری کوردستانیشەوە، وە پێشێل کردنی مافی گەلی کوردە لە دیاری کردنی چارەنووسی خۆیدا.

ئەمە لە کاتێکدا بوو کە روسیای ئەو کاتە خۆی بە پشتیوانی سەرەکی گەلانی چەوساوە پیشان دەداو جاڕی بۆ یەکسانیو بانگەوازی سۆشیالیزمی بۆ هەموو جیهان دەکرد.

ئەمە سەرەرای ئەوەی کە یەکێك لە پرەنسیپە سەرەکیەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، کە جاڕی بۆ داوە، دیاری کردنی مافی گەلانە لە دیاری کردنی چارەنووسی خۆیاندا..(٤١)

وەگرنگترین خاڵ لە مێژووی مەسەلەی کوردا کە کێشەی نێو دەوڵەتی لەسەر دروست بوو سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ بوو. بەهۆی دۆزینەوەی نەوت تیایدا زیاتر رەگی مەسەلەکەی قوڵتر کرد وە بوو بە نەگبەتی بۆ چارەنووسی گەلی کورد.

سیاسەتی بەریتانیا لەگەڵ فەرەنسای هاوپەیمانی دەربارەی ویلایەتی موسڵ (خوارووی کوردستان) ولکاندنی بە عێراقەوە "عێراقی تازە دروست بوو" پێش سیڤەرو پاش سیڤەردا هاو ئاهەنگ بووە...(٤٢) وە هەر لە ئەنجامی ئەو دابەش کردنەشدا بوو، گەلی کورد نەیتوانیوە کە بنەمایەکی ئابووری یەکگرتوو وە بزوتنەوەیەکی رزگاریخوازی یەکگرتوو پێك بهێنێت.

سیاسەتی بەریتانیاو فەرەنسا دەربارەی مەسەلەی کورد پێشتر نەخشەیان بۆ کێشا بوو پێش سیڤەر هەر لەبەر ئەم مەبەستەش، بەندەکانی سیڤەریان بەو جۆرە دارشتبوو.

لە ساڵی ١٩١٩دا بەریتانیا لەگەڵ ئێراندا رێکەوتننامەیەکی مۆر کرد، بۆ دڵنیا کردنی ئێران لە پاراستنی سەروەریو سەربەخۆیی خۆیدا وە ئەم رێکەوتننامەیە ئەوە دەگەیەنێت کە بەریتانیا نایەوێت دەوڵەتێکی یەکگرتووی کوردی دروست بێت...(٤٣) لەبەر ئەوە ولاتانی هاوپەیمان دەیان ویست گۆرانکاری پێویست لە سیڤەردا بکەن لەو مادانەی کە تایبەتن بە مەسەلەی کورد بە جۆرێك لەگەڵ بارودۆخی تازەدا بگونجێت. ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٢١ رێکەوتننامەی نێوان

فەرەنساو تورکیا تەواو شەرعیەتی بە حکومەتی ئەنقەرەدا. کە حکومەتی سوڵتان دەتوانێت پەیماننامەی سیڤەر بەر پەرچ بداتەوە هەر بە گوێرەی ئەم ڕێکەوتننامەیە سنوری نێوان تورکیاو سوریا پاشان لە پەیماننامەی لۆزاندا جەختی لەسەر کراو پشتی پێ بەسترا. هەر بە سەرکەوتنی کەمال ئەتاتورك و دەست بەسەرا گرتنی دەسەڵات، هاوپەیمانەکان پەیماننامەی تازەیان لەگەڵ تورکیادا مۆر کرد.

بە پێی پێداویستی بارودۆخی تازە دروست بوو، ئامادە بوون کە پەیماننامەی سیڤەر بگۆڕن کە لەگەڵ وەزعی ئەو روداوانە بگونجێ کە هەن، تورکیا داوای گۆڕینی مادەی (٦٤)ی سیڤەری بە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا ڕاگەیاند لە ١٩٢١ کە ئاماژە بۆ دروست کردنی دەوڵەتی کوردی دەکات هەروەها هەر لە کۆتایی مانگی (١٢ی ١٩٢٢)دا ئێران داوای لە بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیا کرد کە لە کۆنفرانسی لۆزاندا لە سنوری ناوچە کوردیەکانی نێوان تورکیاو ئێراندا بەرژەوەندی ئێران لەبەر چاو بگرن، بەریتانیاش ئێرانی دڵنیا کردەوە کە مەسەلەی پێك هێنانی دەوڵەتی کوردی یان ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردی لە تورکیا وەك و لە سیڤەردا دیاری کراوە لە ئارادا نەماوە.

بەم جۆرە لە کۆنفرانسی لەندەن دا فەرەنساو ئیتالیا داوای دەستکاری کردنی سیڤەریان کرد وە دژی سیڤەر قسەیان کرد، وە سەرکەوتنی ئەتاتورك لە شەڕدا هۆی سەرەکی بوو بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی سیڤەرو زەمینە خۆشکردن بۆ کۆنفرانسی لۆزان...(٤٤)

لە پەیماننامەی لۆزاندا باس لە دەوڵەتی ئەرمەنستان و کوردستان بە هیچ جۆرێك نەکرا، تەنانەت هەموو مافەکانی گەلی کوردی تێدا پێشێل کرا، لە دیاری کردنی مافی چارەی خۆنووسین دا تەنها چەند مافێکی سەرەتایی نەبێت کە لە مادەی "٣٨، ٣٩، ٤٠" فەسڵی سێیەمدا باسی لێوە دەکات کە دەڵێت: حکومەتی

توركيا دەبێت بەڵێن بدات کە کوردەکان کەمینەی ڕەگەزی لە تورکیا پێك دەهێنن بە ئاشکرا مافی گفتوگۆ کردنو نوسینیان بە زمانی خۆیان هەبێت وە لە بەرامبەر دادگاکانی تورکیادا بەکاری بهێنن. وەمافی دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤارو کتێبیان هەبێت، وە مافی دامەزراندنی یانەی کۆمەڵایەتیو زانستی کوردیان هەبێت وە مافی گەرانو هاتو چۆکردن یان هەبێت بە سەربەستی لە ناو تورکیاو دەرەوەیدا، وە دەبێت هەموو مافێکی سیاسیان وەك تورکەکان پێببەخشرێت...(٤٥)

کودەتای ئەتاتورك نەیهێشت پەیماننامەی سیڤەر سەرکەوتن بەخۆیەوە ببینێت، بەڵکو لە جیاتی ئەوە پەیماننامەی لۆزان مۆرکرا لە نێوان تورکیاو هاوپەیمانەکاندا.

سەبارەت بە چارەنوسی "ویلایەتی موسڵ" هیچ شتێك باس نەکرا، وەنەخرایە ناو ئەم پەیماننامەیەوە، بەڵکو بەجێ هێڵرا بۆ ڕێکەوتنەکانی پاشتر لە نێوان تورکیاو بەریتانیای گەورەدا بە سیفەتی دەوڵەتی خاوەن دەسەڵاتو "سلطة منتدبة" لەسەر عێراق...(٤٦)

سەبارەت بە کۆنگرەی لۆزانی یەکەم لە ٢٧ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢دا بەسترا لەسەر بانگ هێشتی بەریتانیای گەورەو فەرەنساو ئیتالیا لە پێناوی بەستنی کۆنگرە لە لۆزان لە سویسرادا بۆ حکومەتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانو یابانو ژاپۆنو ڕۆمانیاو یوغسلافیاو بولگاریا وە حکومەتی قوستەنتینەی عوسمانیو حکومەتی ئەنجومەنی نیشتمانی گەورە لە ئەنقەرە، هەروەها روسیاش بانگ هێشت کرا بوو. بەڵام ئەمەریکا بەشداری کردنی ڕەت کردەوە، چونکە بڕیاری شەڕی لە دژی تورکیا ڕانەگەیاندبوو. بەڵکو چاودێری نارد بۆ کۆنگرەکە، مەبەستی ئەم کۆنگرەیە بۆ تویژینەوە لە کێشەی یۆنانو تورکیا و بەستنی پەیماننامەی ئاشتی تازە لەگەڵ تورکیای کەمالیدا کە جێگەی پەیماننامەی سیڤەر بگرێتەوە.

هەروەها لە پرۆژەی کارەکانیاندا باس لە چۆنیەتی دۆزینەوەی چارەسەر کرا بۆ کێشەی هەرێمایەتیو دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشەی موسڵ، وە رێسای دەربەندەکانو کێشەی کەمینەکان ئەمە جگە لە کێشە ئابووریو داراییەکان وەك قەرزی گشتی عوسمانیو هەروەها چۆنیەتی پاراستنی بەرژەوەندییە ئابووری‌یەکانی بێگانە.

کۆنگرەی لۆزانی یەکەم سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا لە ٤ی شوباتی ١٩٢٣دا، بەهۆی رەتکردنەوەی پرۆژەی پەیماننامەی ئاشتی لە لایەن تورکیاوە.

پاشان کۆنگرەی لۆزانی دووەم دێت لە ٦ی مارتی ١٩٢٣دا ئەم جارە پەیماننامەی ئاشتی بۆ دواجار ئیمزا کرا، لە نێوان تورکیاو هوپەیمانەکان، ئەوانەی کە ئیمزایان کرد بریتی بوون لە بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتالیا، ژاپۆن، یۆنان، رۆمانیا، هەروەها یوگسلافیاش بەشدار بوو...(٤٧)

هەندێك لە مادەکانی ئەم پەیماننامەیە پەیوەندی بە کێشەی (ویلایەتی موسڵ)ەوە هەبوو، برگەی دوو لە مادەی سی‌یەم لە پەیماننامەی لۆزان باس لە دیاری کردنی هێڵی‌سنور دەکات لە نێوان تورکیاو عێراقدا بە پێی ریکخستنو دیاری کردنێکی دۆستانە لە نێوان بەریتانیای گەورەو تورکیادا لە ماوەی نۆ مانگدا.

چونکە ئەگەر لە ماوەی ئەو نۆمانگەدا نەگەیشتنە رێکەوتنێك لە نێوان خۆیاندا، ئەوا ئەو ناکۆکی‌یە بەرز دەکرێتەوە بۆ (ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان)، وە هەتا کاتی گەیشتن بەو جۆرە بریارە سەبارەت بە ناکۆکی‌یەکان، دەبێت هەردوو حکومەت پەیمان بدەن کە هیچ جموحوڵێکی سەربازی وەیان غەیری سەربازی لە لاین هیچ لایەنێکیانەوە روونادات کە ببێتە هۆی شێواندنی ئەو بارودۆخەی ئێستا لەو ناوچەیەدا کە "چارەنووسی کۆتایی بەستراوە بەو بریارەوە" لە ئارادایە.

کۆمەڵەی گەلان لە ٣٠ی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٤دا بڕیاریدا بۆ پێك هێنانی "لیژنەی لێکۆڵینەوە" بۆ بەرجەستە کردنی کێشەکە، وە پێشکەش کردنی ڕاسپاردەی پێویست بۆ ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلان..(٤٨)

ئەوەی شایانی باس بێت پێویستە ئەوە بیر بخەینەوە کە ئامانجی بەریتانیا، نەوتی "ویلایەتی موسڵ" بوو، وە چۆنیەتی دەست بەسەرا گرتنی ئەو سامانە دەبوایە هەرچۆنێك بێت لەژێر دەسەلاتی تورکەکاندا دەری بهێنێت ئەویش لە ڕێگەی پێك هێنانی دەوڵەتێکیتر کە لە ژێر دەسەڵاتی خۆیدا بێت، ئینگلیزەکان هەر لە زووەوە، بەبوونی نەوتیان دەزانی لەو ناوچەیەدا، لەبەر ئەوە سەفیری بەریتانی لەلای حکومەتی سوڵتان لە ٢٨ی حوزەیرانی ١٩١٤، دوای هەوڵێکی زۆر توانی کە "ئیزنی پشکنین بەدوای نەوت"دا بەدەست بهێنێت بۆ "کۆمپانیای نەوتی تورکی" کەخۆی لە بنەڕەتدا کۆمپانیایەکی ئینگلیزی بوو. هەوڵەکانی بەریتانیا هەر لە پەیمننامەی "سایکس بیکۆدا" دەرکەوت، کە هەوڵیدا دەوڵەتێك دروست بکات کە هەرسێ "ویلایەتی موسڵو بەسرەو بەغدا" بگرێتەوە. بۆ ئەمەپێویستی بەوە بوو کە سەرەتا ویلایەتیموسڵ لە ژێر چنگی فەرەنسا دەربهێنێت، بێگومان ئەمەشی بۆ چووە سەر لە ١٥ی ئەیلولی ساڵی ١٩١٩دا بەرامبەر بە چەند "لێخۆش بوونێك-تنازولات" بۆ فەرەنسا کە بریتی بوو لە:

١.بەدەست هێنانی فەرەنسا لە چەند "سهم"ێك. لە نەوتی موسڵ ئەویش لە ڕێگەی چاك کردنی ڕیکەوتنانامەی ١٥-١٧ی ئایاری ساڵی ١٩١٦دا.

٢.دەبێت ئینگلتەرە پاڵپشتی ڕەهای فەرەنسا بکات لە بەرامبەر ئەمریکادا.

٣.ئەگەر دوای جەنگ بڕیاری "ئینتداب" یان دا دیمەشقو حەلەبو ئەسکەندەرونەو بەیرت لە ژێر سەرپەرشتی فەرەنسادا بێت.

ئابەم جۆرە بەریتانیا توانی ویلایەتی موسڵ لە ژێر چنگی فەرەنسییەکان دەربهێنێتو دەسەڵاتی خۆی بەسەریدا بسەپێنێت. لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی

که سەروەری تورکیا بەسەر ویلایەتی‌موسڵدا، تا پێش ئیمزا کردنی پەیماننامەی لۆزان بووە لە ٢٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٢٣دا. تورکیا کە تەنازولی کرد بە پێی هەردوو مادەی (٣-١٦)ی ئەو پەیماننامەیە، ئەم تەنازولە بە هەڵواسراوی مایەوە تا دەرچوونی بڕیاری ئەنجومەن کە دەبوایە هەردوولا پەیوەست بن پێوەی. "لە کۆنگرەی قاهرە"دا بڕیاری دروست کردنی عێراقێکی سەربەخۆ راگەیەنرا. ئەم کۆنگرەیە لە ٢٢ی ئازاری ساڵی ١٩٢١دا بە سەرۆکایەتی وەزیری کۆلۆنیالی بەریتانی. ئەو کاتە، "مستەر تشرشل" بەسترا بە ئامادە بوونی نوێنەرانی عەسکەری‌و سیاسی‌یەکانی ناوچەی رۆژهەلاتی ناوەراست، کە باس لە داننانی مەلیکی عەرەب کرا لە هەمان کاتدا باس لە وەزعی ناوچە کوردیەکانیش کرا. بەریتانیاش نەیئەتوانی خۆی لەم مەسەلەیە گێل بکات، لەبەر ئەوە سیاسەتی ئینگلیز ئەو کاتە بەرامبەر بە مەسەلەی کورد لەسەر بنەرەتی دوو "هۆکار-اعتبار" دا دەنرا:

یەکەم: حکومەتی بەریتانیا نەیدەتوانی ئارەزووی کوردەکان پشت گوێ بخات، سەبارەت بە داواکارییە رەواکانیان، کە هەوڵی رزگار بوونیان دەدا، لە ژێر زەبری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌دا وەلەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە، گەورەترین گۆرانکاری بە خۆیەوە بینی وە پەیماننامەی سیڤەر باسی لە هەندێ لەو مافانە کردبوو، سەبارەت بە کوردەکانی باکور.

دووەم: ئارەزوو ویستی بەریتانیا بۆ جێگیر کردنی باشوری کوردستان لەناو "دەوڵەتی تازەی دروست کراودا" ئەمە زیاتر دڵنیایی مسۆگەر ئەکرد بۆ پاراستنی بەرژەوەندی‌یەکانی کە دەتوانێت دەسەلاتی تەواوی بەسەر کارو باری ئەو دەوڵەتە تازەیەدا بسەپێنێت.

## ٥.پێك هێنانی لیژنەی تایبەت بەلێكۆڵینەوە لەلایەن كۆمەڵەی گەلانەوە سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ:

سنوری هەرێمی نێوان توركیا و عێراق دیاری كرا، ناویان لێنا بە (هێڵی بڕۆكسڵ) پاشان لیژنەكە راپۆرتێكی ئامادە كرد.

كە ئەو دەرئەنجامەی گرتەخۆ كە پێی گەیشت بوون لەگەڵ چەند پێشنیارێكیان هەبوو:

بە رای لیژنەكە پێویستە ئەو ناوچەی كە ناكۆكی لەسەرە دابەش نەكرێت، چونكە بەڵگەیان بە دەستەوەیە كە یارمەتیان دەدات بۆ بەستنەوەی هەموو ناوچەی باشووری هێڵی بڕۆكسڵ بە عێراقەوە، بە تایبەتی بەڵگەی جوگرافیو ئابووری. بەڵام چەند خاڵێك هەیە دەبێت لەبەر چاو بگیرێت لەوانەش:

١.كە ناوچەكە لە ژێر (ئینتداب–سەرپەرستی) كۆمەڵەی گەلاندا بمێنێتەوە بۆ ماوەی٢٥ساڵ.

٢.دەبێت خواستی كوردەكان لەبەر چاو بگیرێت، سەبارەت بە دانانی فەرمانبەرانی كورد لە بەرێوە بردنی ناوچەكانیاندا، هەر لە كارو باری دادوەریو خوێندنو پەروەردەدا، ئەمە جگە لەوەی دەبێت زمانی كوردی زمانی رەسمی بێت لە فێرگەكاندا.

لەبەر ئەوەی لیژنەكە ئەو راستیانەیان لەلا بەرجەستە بوو بوو كە كوردەكان نەعەرەبن نە فارسن وە نە توركن بەڵكو گەلێكی جیاوازن.

بەڵام كە مەسەلەكە دێتە سەر بەرژەوەندی داگیركەران، توركەكان كوردیان دەدایە پاڵ خۆیان، فارسەكان كورد بە ئێرانی دەدەنێتو تەنانەت مەلیكی تازە دانراویش داوای دەكرد كە كوردەكانی بدرێتە پاڵ. حكەمەتی توركی دانی بە بڕیاری ئەنجومەنی كۆمەڵەی گەلاندا نەدەنا. بەڵكو بەلایەوە كێشەكە بڕیاری لەسەر

نەدراوە، هەر بە كراوەیی بەجێی هێشتووە. بەریتانیا توركیایان چاوترسێن دەكرد، بەڵام بەشێوەیەكی ناراستەوخۆ ڕۆژنامەكانی بەریتانیا توركیایان لەوە ئاگادار دەكردەوە ئەگەر بەیەكدادان لە نێوان توركیاو بەریتانیادا روبدات بە هۆی ویلایەتی موسڵەوە ئەوا ئەو كاتە ئیتالیاو یۆنان تەنانەت بلغاریاش دووره پەرێز ناوەستنو سەیری بارودۆخەكە بكەن، بەڵكو ئەوانیش دێنە ناوەوەو باشترین فرسەتیان بۆ هەڵدەكەوێت بۆ بەدی هێنانی چاوتێبڕینیان لە ئاسیای بچوكدا.

ئەمە لەلایەكەوە، لە لایەكیتریشەوە ڕێبازێكی تریان تاقی دەكردەوە، ئەویش لە ڕێگەی ڕاكێشانی توركیاو بەڵێن پێدانی بە دانی قەرزێكی زۆر بە بڕی "بیست ملیۆن دینار لە لەندەن".

هەروەها كەم كردنەوەی زۆری قەرزی عوسمانی لە كاتی هەڵسەنگاندنی سامانەكانی دەوڵەت كە دەدرێت بە عێراق.

لەگەڵ ئەمانەشدا توركیا ئەم هەموو خستنە رووەی ئینگلیزەكانی رەت كردەوە، بەڵام توركیا نەیدەتوانی هەتا سەر روو بەرووی كۆمەڵەی گەلانو بەریتانیای خاوەن شكۆ بوەستێتەوە.

لەبەر ئەوە دایەلۆگی نهێنی هەبوو لە نێوان "ئەلسەر رۆناڵد لندسیو تۆفیق روشدی بەگ". پاشان ئەم دانیشتنانە سەركەوتنی بەدەست هێنا. ئەوە بوو لە كۆتاییدا توركیا رازی بوو لە دان پیانانی بەگرتنە خۆی عێراق بۆ "ویلایەتی موسڵ" بەرامبەر بە رووداني گۆرانكارییەكانی بچوك لە هێلی سنورداو هەروەها لە بەشەكەیدا لە نەوتی موسڵدا.

ئەم پەیماننامەیەی نێوان عێراقو بەرتانیاو توركیا چوە قۆناغی جێبەجێ كردنەوە لە حوزەیرانی ١٩٢٦دا..(٤٩)

لەو هۆكارە سەرەكیانەی كە وایان لە توركیا كرد، جەخت لەسەر گەرانەوەی ویلایەتی موسڵ بكات لەبەر بوونی بە شێك لە گەلی كورد دەترسا لە باشوور، بوونیان هەبێتو لە ژێر دەسەلاتی خۆیدا نەبێت.

توركیا لە پاشە رۆژی خۆی دەترسا كە بەسەر ئەو بەشەی باشووردا ناتوانێت سیاسەتی بە تورك كردنی كورد پەیرەو بكات، وە دەبن بە كێشەی سەرەكی بۆ بەشی باكور.

توركیا دەیزانی تەنها رێگرێك لەبەردەم پرۆسەی لەناوبردنی كورددا، بوونی كوردەكانی باشوورە ئەگەر هاتوو هەر شتێك بەدەست بهێنن ئەوا بێگومان كاریگەری گەورەی دەبێت لە سەركوردەكانی باكوور. بەریتانیا گوێی بەمە نەدا، بەڵكو تەنها مەبەستی بەریتانیا دەست بەسەرا گرتنی ویلایەتی موسڵ بوو لەناو عێراقێكی یەككگرتوودا. بۆ ئەم مەبەستە پەیماننامەی "بەریتانی عێراقی" سێیەم لە وەزارەتی كۆلۆنیالی بەریتانی لە ١٤ی كانوونی یەكەمی ساڵی ١٩٢٧دا ئیمزا كرا وە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەقی ئەم پەیماننامەی بۆ ئەنجومەنی كۆمەڵەی گەلان نارد، لەگەڵ (بیر خەرەوەیەكی-مذكرة) نهێنیدا كە لە ٢ی ئازاری ساڵی ١٩٢٦دا بوو..(٥٠)

لیژنەی كۆمەڵەی گەلان: بۆ لێكۆڵینەوە لەسەر بارو دۆخی ناوچە داگیر كراوەكانی "كوردستانی عێراق-باشووری كوردستان" لە ساڵی ١٩٢٤دا پێك هات.

لیژنەكە جەختی لەسەر پێداویستی بەجێهێنانی "استفتاء-راپرس" دەكرد كە لە ناوچە كوردەكاندا بكرێت، وەماوەی ٢٥ساڵ وەك قۆناغی ئینتداب دیاری كرا كە لەلایەن كۆمەڵەی گەلانەوە بەرێوە ببرێت. هەر لە تشرینی یەكەمی ١٩٢٤دا بوو، لە سلێمانییەوە دوو (مذكرة-بیرخەرەوەیان) بۆ ئەنجومەنی كۆمەڵەی گەلان نارد، داوایان دەكرد كەدژی چوونە پاڵ توركیان، كوردو تورك دوو میلەتی جیاوازن بە پێچەوانەی توركیا كە كوردی بە تورك لە قەڵەم دەدا.

کە سەروەری تورکیا بەسەر ویلایەتی‌موسڵدا، تا پێش ئیمزا کردنی پەیماننامەی لۆزان بووە لە ٢٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٢٣دا. تورکیا کە تەنازولی کرد بە پێی هەردوو مادەی (٣-١٦)ی ئەو پەیماننامەیە، ئەم تەنازولە بە هەڵواسراوی مایەوە تا دەرچوونی بڕیاری ئەنجومەن کە دەبوایە هەردوولا پەیوەست بن پێوەی. "لە کۆنگرەی قاهرە"دا بڕیاری دروست کردنی عێراقێکی سەربەخۆ ڕاگەیەنرا. ئەم کۆنگرەیە لە ٢٢ی ئازاری ساڵی ١٩٢١دا بە سەرۆکایەتی وەزیری کۆلۆنیالی بەریتانی. ئەو کاتە، "مستەر تشرشل" بەسترا بە ئامادە بوونی نوێنەرانی عەسکەری‌و سیاسی‌یەکانی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست، کە باس لە دانانی مەلیکی عەرەب کرا لە هەمان کاتدا باس لە وەزعی ناوچە کوردیەکانیش کرا. بەریتانیاش نەیئەتوانی خۆی لەم مەسەلەیە گێل بکات، لەبەر ئەوە سیاسەتی ئینگلیز ئەو کاتە بەرامبەر بە مەسەلەی کورد لەسەر بنەرەتی دوو "هۆکار-اعتبار" دا دەنرا:

یەکەم: حکومەتی بەریتانیا نەیدەتوانی ئارەزووی کوردەکان پشت گوێ بخات، سەبارەت بە داواکارییە ڕەواکانیان، کە هەوڵی ڕزگار بوونیان دەدا، لە ژێر زەبری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌دا وەلەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە، گەورەترین گۆڕانکاری بە خۆیەوە بینی وە پەیماننامەی سیڤەر باسی لە هەندێ لەو مافانە کردبوو، سەبارەت بە کوردەکانی باکور.

دووەم: ئارەزوو ویستی بەریتانیا بۆ جێگیر کردنی باشوری کوردستان لەناو "دەوڵەتی تازەی دروست کراودا" ئەمە زیاتر دڵنیایی مسۆگەر ئەکرد بۆ پاراستنی بەرژەوەندی‌یەکانی کە دەتوانێت دەسەڵاتی تەواوی بەسەر کارو باری ئەو دەوڵەتە تازەیەدا بسەپێنێت.

## ٥.پێك هێنانی لیژنەی تایبەت بەلێكۆڵینەوە لەلایەن كۆمەڵەی گەلانەوە سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ:

سنوری هەرێمی نێوان تورکیا و عێراق دیاری کرا، ناویان لێنا بە (هێڵی بروکسڵ) پاشان لیژنەکە راپۆرتێکی ئامادە کرد.

کە ئەو دەرئەنجامەی گرتەخۆ کە پێی گەیشت بوون لەگەڵ چەند پێشنیارێکیان هەبوو:

بە رای لیژنەکە پێویستە ئەو ناوچەی کە ناکۆکی لەسەرە دابەش نەکرێت، چونکە بەڵگەیان بە دەستەوەیە کە یارمەتیان دەدات بۆ بەستنەوەی هەموو ناوچەی باشووری هێڵی بروکسڵ بە عێراقەوە، بە تایبەتی بەڵگەی جوگرافی و ئابووری. بەڵام چەند خاڵێك هەیە دەبێت لەبەر چاو بگیرێت لەوانەش:

١.کە ناوچەکە لە ژێر (ئینتداب-سەرپەرستی) کۆمەڵەی گەلاندا بمێنێتەوە بۆ ماوەی٢٥ساڵ.

٢.دەبێت خواستی کوردەکان لەبەر چاو بگیرێت، سەبارەت بە دانانی فەرمانبەرانی کورد لە بەرێوە بردنی ناوچەکانیاندا، هەر لە کارو باری دادوەری و خوێندن و پەروەردەدا، ئەمە جگە لەوەی دەبێت زمانی کوردی زمانی رەسمی بێت لە فێرگەکاندا.

لەبەر ئەوەی لیژنەکە ئەو راستیانەیان لەلا بەرجەستە بوو بوو کە کوردەکان نەعەرەبن نە فارسن وە نە تورکن بەڵکو گەلێکی جیاوازن.

بەڵام کە مەسەلەکە دێتە سەر بەرژەوەندی داگیرکەران، تورکەکان کوردیان دەدایە پاڵ خۆیان، فارسەکان کورد بە ئێرانی دەدەنێت و تەنانەت مەلیکی تازە دانراویش داوای دەکرد کە کوردەکانی بدرێتە پاڵ. حکەمەتی تورکی دانی بە بڕیاری ئەنجومەنی کۆمەڵەی گەلاندا نەدەنا. بەڵکو بەلایەوە کێشەکە بڕیاری لەسەر

سەبارەت بە کاروباری ناوخۆیی‌و خۆبەڕێوەبردنیان. بەڵام لەوە دەچێت هەتا ئێستا نەهاتبێتە دی.

لەبەر ئەوە (لیژنەی هەمیشەیی سەرپەرشتی) بڕیاری چەند ڕاسپاردەیەکی پێشکەش بە ئەنجومەن کرد:

١.ڕەت کردنەوەی سکاڵانامەی کوردەکان کە داوای دامەزراندنی حکومەتی کوردی سەربەخۆ دەکەن لە ژێر چاودێری کۆمەڵەی گەلاندا.

٢.داوا لە دەوڵەتی (منتدب-سەرپەرشتیار) دەکرێت کە "تدابیر-بەخۆکەوتن"ی بەڕێوە بردن‌و یاسا دانان، کە دانرا بوون بۆ دڵنیایی کردنی کوردەکان بەپێی ئەو بارودۆخانەی هەیانە، لەبەر چاو بگرێت وە جێبەجێ بکرێت، بە پێی هەڵوەشاندنەوەی وەیان سستی نواندن لە جێبەجێ کردنیدا.

٣.دەبێت سەیری ئەو مەرجانە بکرێت لە وەرگرتنی بەخۆکەوتنی پێویست بۆ دڵنیا کردنی کوردەکان، لە کاتێکدا ئەگەر هاتوو عێراق لەژێر ڕاسپاردەی دەوڵەتی بەریتانی بە تەواوی ڕزگار بوو.

سەبارەت بە مافەکانی گەلی کورد بەو شێوەیەی ئینگلیزەکان تێی گەیشتبوون‌و دەیان ویست لە چەند مافێکی بەڕێوەبردنی ناوخۆی زیاتر تێنەدەپەڕی‌و دامەزراندنی هەندێ لە فەرمانبەرانی کورد ئەوانەی خزمەتی بەرژەوەندی بەریتانیا دەکەن وەهەندێ مافی تر پەیوەندی دار بە ڕۆشنبیری‌و پەروەردەوە.

هەرچۆنێك بێت هەر چەندە ئەم مافانە سەرەتایی‌و ساکارن، ئەوان تەنها یەك مەبەستیان هەبووە کە بریتی بووە لە سڕینەوەی مافە سەرەکیەکانی گەلی کوردو شێواندنی ئامانجەکانیان.

لە ساڵی ١٩٣٢دا بوو کە ئینتدابی بەریتانی کۆتایی پێهات، وە عێراق لە کۆمەڵەی گەلان وەرگیرا، عێراق هەموو ئەو پرەنسیپانەی پێشووی لە

بەیاننامەیەکی رەسمیدا راگەیاند. وە هێزی دەستوری هەبوو کە لە رێکخراوی نێو دەوڵەتیدا بەجێی هێشتووە.

وە بە بەڵگەنامەیەك دادەنرێت سەرەرای ئەم هەموو بەڵگەنامانە حکومەتی بەریتانیای خاوەن شکۆ (بە سیفەتی وەك دەوڵەتێکی سەرپەرشتیار) وە حکومەتی پاشایی عێراقی لە زۆر کاتی جیاوازدا بەیاننامەی رەسمیان دەرکردووە کە دان پیا نانی بە مافەکانی گەلی کورد دەگرێتەخۆ.

وە چەندەها جار پەیمانیان داوە بە جێبەجێ کردنی، بەڵام بە داخەوە زۆربەی زۆری ئەم بەیاننامانە تەنها بۆ خۆ دەرباز کردن بووە لەو بارودۆخە تایبەتیانەی کە تێی دەکەوتن، کە ناچار دەبوون بەرەو رووی ببینەوە، وە هەر زوو لەبیر خۆیان دەربردەوە.

چ کاتێك بەرژەوەندییەکانیان پێویستی پێنەدەما، بۆ نمونە یەکێك لەو بەیانانەی کە لە کاتی دایەلۆگی لۆزندا لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢دا بڵاویان کردەوە..(٥٣) کە دەڵێت: حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیو حکومەتی عێراق دان دەنێن بەوەی کە کوردەکان مافی ژیانیان هەیە لەناو سنوری عێراقدا، هەروەها مافی دامەزراندنی حکومەتێکی کوردیان هەیە لەناو ئەو سنورەدا وەهەردوو حکومەت ئاواتەخوازی ئەوەن کە لایەنە کوردیەکان لەنێوان خۆیاندا بگەنە رێکەوتنێك لەسەر شێوەی ئەو حکومەتەو وە ئەو سنورەی ئارەزوو دەکەن کە درێژ بێتەوە. یا نوێنەریان بنێرن بۆ بەغدا بۆ گفتوگۆ کردن سەبارەت بە پەیوەندییە ئابووریو رامیارییەکانیان لەگەڵ حکومەتی خاوەن شکۆی بەریتانیو حکومەتی عێراقیدا. هیچ کاتێك پەیمانو بەڵێنەکانی هاوپەیمانەکانو داگیرکەرانی کوردستان بەرامبەر بە کورد راست نەبووە، بەڵکو ئەگەر نەرمیان نیشان دابێتو بەڵێنیان دابێت، تا سەرگرتنی ئامانجەکانیان بووە پاشان هەموو شتێکیان لە پشت خۆیانەوە بەجێ هێشتووە.

پەنا بردنی کوردەکان بۆ چەك تەنها رێگە بووە بۆ بەرگری کردن لە خۆیان لە ولاتێکی بێدۆست لە ولاتێك کە بووە قوربانی بەرژەوەندی داگیرکەران. خواستو داواکاری کوردەکان لە مافی دروست کردنی دەوڵەتەوە هاتە سەر مافە سەرەتاییە مرۆییەکان. تەنانەت ئەمەشیان پێ رەوا نەبینرا.

هەر لەبەر ئەم هۆیە شۆڕشو راپەرین بە رووی داگیرکەراندا تەقیەوە، داگیرکەران سیڤەریان لە گۆرناو لۆزان جێگای گرتەوە، ئەمیش لە مادەکانی (٣٨-٣٩-٤٠)دا لە فەسڵی سێیەمدا (هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد) باس لەمافە سەرەتاییەکانی وەك خوێندنو نوسینو قسە کردن بە زمانی دایك دەکات. لەگەڵ مافی دەرکردنی گۆڤارو رۆژنامە، کەچی ئەم مافە سەرەتاییەشیان رەت کردەوە، بە رەتکردنەوەی پەیماننامەی لۆزان.

ئابەم شێوەیە رەت کردنەوەی دەقێك بوو، لە بەڵگەنامەکانی نێو دەوڵەتی کە باس لە مافی گەلی کورد بکات.حکومەتی تورکی هەموو شێوازێکی چەوساندنەوەی گرتەبەر، لە بەرامبەر ئەمەدا گەورەترین راپەرین لەباکور رویدابە سەرکردایەتی شێخ سەعیدی پیران لە ساڵی ١٩٢٥دا، کە داوای مافی چارەی خۆنوسینی دەکرد.

بەلام شکستیان پێهێناو شۆڕشەکەیان لەناو برد. لە ساڵی ١٩٢٧دا بزوتنەوەیەك لە ئاگریداغ بە سەرۆکایەتی "احسان نوری پاشا" رووی‌دا کە ساڵێکی خایاند پاشان بە شێوەیەکی دڕندانە لەناویان بردن.

وە هەر لە ١٩٢٧دا بوو لە هەرێمی دەرسیم شۆڕشێکیتر رووی‌دائەمیش وەك ئەوانیتر کۆتایی پێهێنرا، کە زۆر بە دڕندانە بۆردومانی ئاسمانی کرانو سەرکردەکانیان لەسێدارە دان، شۆڕشەکانی کوردستان لەیەك پارچە رووی نەدەدا، بەڵکو شۆڕشی سەرتاسەری بوو، هەرچەندە لە رووی سەرکردایەتیو ریکخستنەوە یەکگرتوو نەبوو، بەڵکو هەموویان بارودۆخی بابەتی ئەو جۆرە

شێوازەی بە سەردا دەسەپاند. سەبارەت بە باشوور، شۆڕش بەردەوام بوو بە تایبەتی لە ساڵی ١٩٢٠تا ١٩٣٠، پاشانیش لە ڕۆژهەلاتدا لە مەهاباتدا.

**٦.نێو نەتەوەیی دووەمو مەسەلەی کورد:**

ئەو شێوازە دڕندانەو نامرۆڤانەیەیی کە شۆڕشەکانی پیکۆتایی دەهێنرا، بە تایبەتی لە تورکیا رای گشتی جیهانی جوڵاند، کە نارەزاییان دەربڕی دژی قەسابخانەکانی حکومەتی تورکیا دژی کوردەکان. بە تایبەتی ریکخراوی نێو نەتەوەیی دووەم "کە سۆشیالیستە دیموکراتەکانی ئەوروپا ئەگرێتەوە" نارەزاییان دەربڕی دژی ئەو قەسابخانەیەی تورکەکان بۆ کوردەکانیان داناوە، لیژنەی جێبەجێ کردنی نێو نەتەوەیی دووەم ئەم سیاسەتەیان بە "بەربەرێتی خوێناوی حکومەتی تورکی" لە قەڵەم دا وە ئامارەیان بۆ ئەوە کرد کە حکومەتی تورکی نەك هەوڵی سەرکوت کردنی شۆڕشگێرانی کورد دەدات کە لە پێناوی سەربەخۆییو سەربەستیدا دەجەنگن، بەڵکو هەوڵی لەناوبردنی دانیشتوانی بێتاونی کورد دەدات، کە تەنانەت بەشداریان لە شۆڕشیشدا نەکردووە...(٥٤)

جێگەی سەرنجە ئامارە بۆ "هەڵوێستی نێو نەتەوەیی دووەم" بکەین وە راستییەکان دەربخەین کە پاڵپشتو لایەنگیری کورد نەبوون تا کۆتایی، بە پێچەوانەی ئەوانەی کە زۆریان پیا هەڵدەدەن وا دەزانن کە سۆشیالیستەکان پاڵپشتی کورد بوو. دەبێت ئەوە بڵێین کە ئەمانیش بەرژەوەندی وڵاتەکانی خۆیان لەلا پەسەند تر بووە، وەك بەرگری کردن لە مەسەلە مرۆڤایەتیو نەتەوەییەکان. (نێو نەتەوەیی دووەم) نەك تەنها خراپەکارییەکانی داگیرکەکرانی (ئینگلیزو فەرەنسییەکانی) نەخستە روو، وە ئامارەی بۆ رژێمە کۆنە پەرستە دواکەتووەکانی وەك (عێراقو ئێران)یش نەکرد، بەڵکو زیاتر پاساویان بۆ دەهێنانەوە. (برۆکیر) سەرۆکی لیژنەی جێبەجێ کردن دەڵێت:- پێش ئەوەی قسە

لەسەر مەسەلەی ورد بکەم، دەبێت باس لەو ڕێگرانە بکەم سەبارەت بە هەڵوێستمان لەم مەسەلەیەدا:

١.مەسەلەی کورد مەسەلەیەکی تازەیە.

٢.ئارەزوو نەکردنمان سەبارەت بە بڵاوکرنەوەی مەسەلەی کوردی لەهەریەکە لە عێراق و ئێراندا وەك ئەوەی لە تورکیادا هەیە.

کەواتە ئەمە ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە (نێو نەتەوەیی دووەم) لایەنگری تێکۆشانی کوردەکان ناکات لە دەرەوەی تورکیا، وەك (عێراق و سوریا) چونکە لەژێر دەستی داگیرکەرانی وەك (ئینگلیزو فەرەنسی یەکان)دا بوون، لەبەر ئەوە وتیان ئێمە پشتگیری لە شێوازی چەکداری ناکەین، چونکە دەبێتە هۆی بەیەکدادان لە نێوان دەوڵەتە گەورەکاندا. بڕیاری کۆتایی (نێو نەتەوەیی دووەم) کە (ئۆتۆ باور) خوێندیەوە دەڵێت: نێو نەتەوەیی سەرنجی جیهان رادەکێشێت بۆ ئەو قەسابخانەیەی کە تورکەکان پێی هەڵدەستن، بەڵام نێو نەتەوەیی دووەم دژی پەنا بردنە بەر چەکە، لە پێناوی دیاری کردنی مافی چارەی خۆنوسیندا..(٥٥) ئەمەش شتێکی نەشیاو و چارەسەرێکی بێ مەبەست بوو، چونکە هێزەکانی تورك لە ناوچە کوردی یەکاندا بوو، کە بووە هۆی پێکدادان و دەست پی‌کردنی راپەڕینی خەڵکەکە دژیان. لە ٨ی تەمووزی ساڵی ١٩٣٧دا بەڵگەنامەی کاری هاوبەش لە (سەعد ئاباد) ئیمزا کرا. گوایە ئامانج لەو پەیماننامەیەدا، چارەسەر کردنی کێشە سیاسی یەکانی دەرەوەی تورکیایە. بەڵام لە راستی‌دا ئامانجی چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆیی یەکانی ئەو دەوڵەتانە بوون کە کوردیان تێدا بوو. ئەمە جگە لە ئامانجی ئەوەی کە ڕێگە بگرن لە دەست تێوردانی یەکێتی سۆڤیەت ئەگەر ویستی یارمەتی کوردو ئەرمەن بدات. لە ساڵی ١٩٤٢دا (پەیماننامەی نێوان ئێران و یەکێتی سۆڤیەت و بەریتانیا) بەسترا، بە پێی ئەو پەیماننامەیە سوپای سور بۆ ئێران بنێرن بۆ بەرگری کردن لە سەروەری ئێران. بوونی یەکێتی سۆڤیەت لە ئێران

زەمینەیەکی دیموکراتیانەی بۆ نەتەوەکانی وەك کوردو ئازەر خولقاند، لە دروست کردنی کۆماری تایبەت بە خۆیان بە یارمەتی یەکێتی سۆڤیەت. بەلاّم ئەم دوو قەوارە سەربەخۆیە ساڵێك زیاتریان نەخایاند بە تایبەتی دوای کشانەوەی سوپای سوری سۆڤێتی لە ساڵی ١٩٤٦دا. (کۆماری مەهاباد) رووخاو سوپای ئێرانی هێرشی بۆ هەموو ناوچە کورد نشینەکان دەست پێکرد وە بە شێوازێکی دڕندانە بۆردومانی خەڵکی دەکرد. لێرەدا ئەگەر ئاماژە بۆ هەڵوێستی (یەکێتی سۆڤیەت) بکەین (کە ئەو کاتە خۆی بە پاڵپشتی هەموو گەلانی چەوساوەی دنیا دەزانیو بانگهێشتی شیوعیەتی دەکرد) تەنها کاردانەوەیەك لەو بارودۆخە سەختەدا، پێشکەش کردنی نارەزاییەك بوو، کە وەزیری دەرەوەی سۆڤێت "مۆلۆ تۆف" پێشکەش بە ئە نجومەنی ئاسایشی کرد..(٥٦) لە ناوەراستی نیسانی ساڵی ١٩٦٣دا هەردوو حکومەتی عێراقیو تورکی دانوستانیان دەست پێکرد لە ئەنقەرەو بەغدا بە مەبەستی هەڵسانیان بە چالاکیی هاوبەش دژی بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد. ئەمەش لە ئەنجامی ئەو شۆڕشەی کە لە ئەیلولی ١٩٦١دا دەستی پێکردبوو. مەنغۆلیا یاداشت نامەیەکی پێشکەش بە نەتەوە زیەکگرتووەکان کرد لەسەر مەسەلەی کورد لە عێراق وە داوای دەست تێوەردانو بەشداری نەتەوە یەکگرتووەکانی کرد. بەلاّم بەداخەوە هیچ بەڵگەنامەیەکی رەسمی دەرنەکرا، وە نەگەیشتنە چارەسەرێك لە ئەنجامی فشاری دەوڵەتانی خاوەن بەرژەوەندی لە ناکۆکیەکەدا. دەتوانین بڵێین کە ئەمە بە رووداوێکی مێژوویی دادەنرێت، لەبەدیار خستی مەسەلەی کورد لە گۆرەپانی نێو دەوڵەتی‌دا، بۆ یەکەم جار دوای جاڕدانی بەڵگەنامەی جیهانی سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤو رزگار کردنو سەربەخۆیی گەلانی داگیرکراو. بەلاّم ئەمەش رەت کرایەوە لەبەر ئەوەی وتیان ئەمە دەست تێوردانە لە کارو باری ناوخۆیی عێراق لە ساڵانی ١٩٦١ەوە راپەرینێکی چالاکانەی بەهێز لە کوردستانی عێراق "لەباشوور"دا دەستی پێکرد،

زیاتر شێوەی شەڕی ناوخۆیی وەرگرتبوو، بۆ ماوەی پانزە ساڵ، عێراق لە جیاتی چارەسەرکردنی کێشەکەی لە ڕێگەی بەدیهێنانی داواکاریەکانی گەلی کورد، بەڵکو پەیوەندیکرد بە ئێرانەوە لە ڕێگەی وەزیری دەرەوەی تورکی کە ئەنجامەکەی ڕێکەوتنی هاوکاری هاوبەش لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا کە لە جەزائیر لە مارسی ١٩٧٥دا ئیمزا کرا، بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیە عێراق تەنازولە نیوەی (شط العرب)و هەندێ ناوچەی سنوریی باشورو ناوراستی عێراق بۆ ئێران کرد، بەرامبەر ئەوەش ئێران پەیمانیدا بە ڕاگرتنی یارمەتیەکانی بۆ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد. بەڵکو هەوڵی لەناوبردنیان دەدات، وە تورکیاش لەلایەن خۆیەوە ڕای گەیاند کە هەموو هەوڵەکانی دەخاتە کار لە پێناوی دامرکاندنەوەی شۆڕشەکە وە لە ئەنجامی ئەو ڕێکەوتننامەیەدا، پلانەکەیان سەرکەوتنی بەدەست هێنا، وەتوانیان شۆڕشی کورد لە کوردستانی عێراق کۆتایی پێبهێنن، بەڵام هەردوای ئەوە بەماوەیەکی کەم چالاکی شۆڕشگێرانەی گەلی کورد دەستی پێکردەوە. وە لە ئەنجامەکانی گرنگیدان بە مەسەلەی کورد لە دانیشتنی ٤٢ی لیژنەی مافەکانی مرۆڤ لە نەتەوەیەکگرتووەکان لە جنیف، لە ٣ی شوبات بۆ ١٤ی ئازاری ١٩٨٦. کە گفتوگۆ لەسەر زۆر کێشە کرا لەوانە، مافی چارەی خۆنوسینو پێشێل کردنی مافەکانی گەلی کورد بوو.

لیژنە لاوەکیەکانی دەوڵەتانی سێیەم بەیاننامەیەکیان پێشکەش کرد، کە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە کوردەکان مافی نەتەوییان هەیە، وەك هەموو نەتەوەکانیتر، پێویستە لەسەر هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکانو ئەنجومەنی ئاسایش بۆ لەبەر چاو گرتی کێشەکەو دۆزینەوەی چارەسەرێکی عادیلانە بۆی. بەڵام بە داخەوە ئەم پێشنیارە وەك بەڵگەنامەیەکی ڕەسمی بە شێوەیەکی کۆتیایی ئیمزا نەکرا.

که به ئاشکرا باس له چارەسەر کردنی کێشەکە بکاتەوە. سەبارەت بە کۆنگرەی پاریس که له ئایاری ١٩٨٩دا بەسترا دوای کۆنگرەی مەدریدو ڤییەنا که باس له مەسەلەی پێشێل کردنی مافەکانی گەلی کورد کرا، وە سیاسەتی دگیرکەرانەی ئەو ولاتانە لەسەر گەلی کورد.

نوێنەری سویدو یەکێتی سۆڤیەت و بلغاریا سەرزەنیشتی وەفدی تورکیایان کرد. که پێویستە چارەنوسی گەلی کوردو مافە نەتەوەییەکانیان لەبەر چاو بگیرێت بە جۆرێک پەیوەست بێت لەگەڵ پرەنسیپەکانی (CSCE)هلسنکی و بەلگەنامەکانی مافەکانی مرۆڤ.

## ٧.هۆکارەکانی تێك شکاندنی شۆڕشەکانی کورد بە گشتی

هۆی دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی(٥٧) بەردەوام لەناو بردنی شۆڕشەکانی ئەگەر بمانەوێت چاوێکی خێرا بە هۆکارەکانی لەناو بردنی شۆڕش و راپەرینەکانی گەلی کورددا بنێین پێش سالانی شەڕی جیهانی یەکەم و پاش سالانی دوای شەڕ دەتوانین بڵێین:

زۆربەی بزوتنەوەو راپەڕینی رزگاریخوازی گەلی کورد، زیاتر مۆرکێکی ناوخۆیی هەبووە، لە ئەنجامی سیاسەتی جیاکاری و رەگەز پەرستانەی کە کوردەکان دوچاری دەبونەوە.

ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکیترەوە واقعی ناسۆری جەماوەری کورد بە تایبەتی جوتیاران کە لە ژێر زەبری چەوساندنەوە دەیان نالاند، لە لایەکیترەوە سەرکردەکان و سەرکردایەتی شۆڕشەکان بەدەست سەرۆك خێڵەکان و دەرەبەگ و پیاوانی ئاینیەوە بوو.

ئەمە سەرەرای ئەوەی کە رێکخستنێکی ئەوتۆی نەبووە تەنانەت ئامانج و دیدەی رامیاریان ئاشکرا نەبووە. ئەمە جگە لەوەی ئەو جۆرە سەرکردایەتیە زۆر جار کاریگەری دەرونی و سۆز بەسەر لایەنی ژیری، سیاسی دا زاڵتر دەبوو. زۆر جار شۆڕشیان بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان بەکار دەهێنا، کە لەگەڵ بەرژەوەندی جەماوەری گەلدا نەدەگونجا وەزۆرجار سەودایان لەسەر حسابی بەرژەوەندی باڵای گەل دەکرد.

بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو راستی یە ناشارێتەوە کە ئارەزووی جەماوەری کورد بەگشتی، نەمانی زوڵم و زۆرداری داگیرکەران و بەدیهێنانی خواستە نەتەوەییەکان بوو.

سەبارەت بە شۆڕشەکانی کورد دوای ساڵانی ١٩٠٨ وە بەتایبەتی ئەو شۆڕشانە زیاتر قوڵترو هۆشیارتر بوون لە روی رێکخستن و ئامانجەکانیانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بزوتنەوەی کوردی سەرکردەی پێگەیشتوو وە تێگەیشتووی کەم بوو. چونکە ئەو کاتە کۆمەڵگای کوردی حزب و رێکخراوی جەماوەری نەبوو وە ئەوانەی کە هەبوون زیاتر لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە سەریان هەڵدا. لەبەر ئەم مەبەستە دەڕوانین هەمیشە سەرکردەکانی کورد لەوانە بوون کە خاوەن پلەیەکی بەرزن لە کۆمەڵگای کوردەواریدا.

و بەرژەوەندی چینایەتی تەسکیان هەبووە کە زۆرجار تێ دەکەوتن وە نەیان دەتوانی سەرکردایەتی ئەو بزوتنەوانە بکەن هەتا کۆتایی.

ئەمە سەرەرای هەڵوێستی چینی فەرمانڕەوای خاوەن دەسەڵات بە تایبەتی لە تورکیا کە وێنەی دڕندەترین چینی فەرمانڕەوا بوون وە ئیمپریالیزمی جیهانیش پشتگیری لێ دەکردن لەبەر بەرژەوەندییەکانی خۆیان. دۆزینەوەی نەوت یەکێك بوو لەو هۆکارە سەرەکیانەی سەر نەگرتنی شۆڕشەکانی کورد. کەواتە بە پێداچوونەوەیەکی مێژوویی بە پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکانداو هەروەها ئەو

پەیماننامانـەی کـە مەسـەلەی کوردیـان گرتبووەخـۆ، هـەر لـە جـەنگی جیـهانی یەکەمـەوە تـا دەگاتـە شـەڕی کـەنداو. هەمیشـە کـورد لایـەنی سـێیەم بـووە تیـایدا. هۆکـاری سـەرەکی بـۆ دروسـت کردنـی ئـەم بارودۆخـە و پشـت گـوێ خسـتنی مەسەلەی کود وە گرنگی پێ‌نەدانی لەلایەن کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیەوە دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك:

یەکەم: هەندێکیان (خوێن) بە ستراوە بە شێوازی تێکۆشانی بێ کاریگەر.

دووەم: هەڵـەی سـتراتیجی بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی کـورد بـە سروشـتی ناکۆکیەکەوە، پاشان رێگەی بەدیهێنانی ئامانجەکانیان.

سـێیەم:دەسـت تـێوەردانی هەرێمایـەتی ئەمـە جگـە لـە بەرژەوەندییـەکانی وڵاتانی دەوروبەر بە شێویەکی راستەخۆ.

چوارەم: ئەو سیاسەتەی کە وڵاتە گەورەکان پەیڕەویان دەکرد لە ناوچەکەداو کاریگەرێتی سلبی لەسەر واقعی مەسەلەی کورد، ئەمە جەمسەری سیاسەتی نێو دەوڵەتی پێك دەهێنا وە کاریگەری دەوڵەتە هەرێمایەتیەکان لەسەر سیاسەتی نێو دەوڵەتی سەبارەت بەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە مەسەلەی کوردەوە هەبووە.

ئەمە تەوەری گەشە کردنی مەسەلەی کورد بووە بە درێژایی ئەم سەدەیە هەتا ئەمرۆمان ئەم سیاسەتە بەرجەستە دەکرێت.

# دەرئەنجام

پێویستە لەسەر سەرکردەکانی کورد کە لێپرسراوێتی مێژوویی دەکەوێتە سەر شانیان، زۆر ورد بین بن لەیەکالاکردنەوی بارودۆخی ئێستامان، بەجۆرێك لە بەرژەوەندی کێشەکەماندا بێت. وە نابێت هەڵە ستراتیجیەکان دووبارە بکرێتەوە وەنابێت هەلی مێژوویی ئەمجارە لە کیس بدرێت کە دوای نزیك لە سەدەیەك دەبێت، دووبارە بۆتەوە چونکە مێژوو جارێکیتر خۆی دووبارە دەکاتەوە. تەنها جیاوازی لە دەمو چاوەکاندایە.

داگیرکەران هەمان داگیرکەرانی کوردستانن.بە داخەو ئەگەر بڵێین ئەقڵیەتی سیاسی کوردیش بەرادەی پێویست گەشەی نەکردووە. چونکە تا ئێستا بەرژەوەندی حزبیو کەسی سەرکردەکان لەسەرو بەرژەوەندی بالای میللەتەکەمانەوە بووە. بەهێزترین بەڵگەشمان شەڕی کورد بە کورد بەکوژدانە. دووبارە جەخت لەسەر ئەوە دەکەینەوە دەبێت سەرکردەکانی کورد لە ئاستی گۆرانکاری‌یە نێو دەوڵەتیو هەرێمایەتیەکاندا بن.

وە بە باشترین رێگاو بە ئاگادارییەوە مامەڵە لەگەڵ هەڵوێستەکاندا بکەن، داواکاری گەلی کورد لە دیاری کردنی مافی چارەی خۆنووسینو پێك هێنانی دەوڵەتی کوردی ئەمە خەونی دێرینی هەموو کوردێکە، وە مافی رەوای گەلی کوردە. بەلام ئەگەر واقع بینانە لە کێشەکەمان بڕوانین دەبێت زۆر خالی گرنگ هەیە لەبەر چاو بگرین ئەوەی کە بەرژەوەندی دەوڵەتە زلهێزەکان لەگەڵ بەرژەوەندی دەوڵەتە داگیر کەرانی کوردستانەدایە کەناتوانن هەروا بە ئاسانی پشت لە بەرژەوەندی‌یەکانیان بکەن لە ناوچەکاندا..(٥٨) وە لەلایەکیترەوە داگیرکەرانی کوردستان، هیچ کاتێك کۆكو تەبا نین هەریەکەیان ناکۆکی

مێژوویی‌یان لەگەڵ ئەوی‌تردا هەیە. بەڵام کە مەسەلەکە دێتە سەر کێشەی کورد، هەموو ناکۆکی‌یەکان وەلا دەنێن‌و لەسەر کورد کۆك‌و تەبان، هەمان هەڵوێستی دوژمنکارانەیان هەیە بەرامبەر بە کورد. ئەمەش جگە لەوەی کە کورد خۆیشی نەك ڕێکخراوی یەکگرتووی سیاسی‌یان نی‌یە بەڵکو جیاوازی لە بۆچوون‌و تەنانەت لە ئامانج‌و دۆزینەوەی ڕێگاچارە بۆ مەسەلەکان بە ئاسانی دەبینرێت. هەروەها لاوازی ئاستی وشیاری جەماوری کورد کە تا ئێستا دیاردەی ئەوانە "پاشکۆیەتی-تبعیە" لە پلەیەکی بەرزدایە. ئەمە ڕاستی وتەیەکی "د.ئیسمایل بێشکچی"مان بۆ دەسەلمێنێت کە دەڵێت: "پلەی کۆمەڵایەتی نەتەوەیی کورد نزمترە لە ئاستی نەتەوەیەکی کۆڵۆنی ، پلەی کۆمەڵایەتی کوردستان نزمترە لە ئاست خاکێکی بە کۆڵۆنی‌کراو"..(٥٩)

لەبەر ئەوەی مرۆڤی کورد مرۆڤێکی ترسێنراوەو لە پەل‌و پۆ خراوە، هەست بە نزمێتی وە هەست بەبێ هیوایی‌و بەهێزی داگیرکەرانی ئەکات.

چونکە هەمیشە بە بەردەوامی هەوڵ دەدرێت بۆ سەرکوتکردن‌و لەناو بردنی پێناسنامەی نەتەوەیی کورد، ڕاستە کوردستان پلەی کۆمەڵایەتی لەناوچە داگیرکراوەکانی تر نزمترە، لەبەر ئەوەی لە کوردستاندا بینراوەو بەسەر کوردا سەپاندویانە، لە هیچ شوێنێکی تردا نەبینراوە. ئەمە وای کردووە کە ڕۆڵی جیا کردنەوە یان تایبەتمەندێتی وەربگرێت. چونکە کورد خرایە دۆخێکەوە کە تیایدا مەبەست بوە ژێر دەستیەکەی هەتا هەتایی بێت‌و بۆ هەمیشەیی دابەشکراو بێت، دوور لەیەك‌و لە یەك ترازاو بێت‌و بەبێ پێناسنامە بمێنێتەوە.

کورد لە پێناوی دابین کردنی مافە نەتەوایەتیەکاندا هەمیشە لە گۆماوی خوێندا گەوزێنراوە. چونکە شوێنگای جوگرافیای دورە دۆستە "کەهەرگیز دۆستی نەبووە" بەڵکو چوار دەوری بە دوژمن دا تەنراوە. گەر بگەڕێینەوە سەر دۆزینەوەی چارەسەری واقیع بینانە بۆ کێشەکەمان. پێویستە هەر پارچەیەکی

داگیر کراوی کوردستان به پێی بارودۆخی تایبەتی خۆی وەربگیێن، چونکه بەهۆی شێوازی دابەشکردنەکەیەوە، هەر پارچەیەك تایبەتمەندێتی خۆی وەرگرتووە.

جا ئەو کاتەی هەر پارچەیەك لە پارچەکانی کوردستانی گەورە توانی ئازادی‌و سەربەخۆیی خۆیان بەدەست بهێنن، ئەو کاتە مەسەلەی پێك هێنانی دەوڵەتی کوردی یەکگرتوو مەسەلەیەکی زۆر بەجێ‌و حەتمی دەبێت، وەنابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە پێك هێنانی دەوڵەتی کوردی ئامانجی دوورو نزیکمانە.

سەبارەت بە باشووری کوردستان یاخود کوردستانی عێراق لە رۆژگاری ئێستاماندا دیاری کردنی چارەنووسی گەلی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی فیدراڵیدا، لەسەر بناغەیەکی واقعی‌و یاسایی چارەسەرێکی لەبارەو تایبەتمەندیەکی خۆی هەیە، کە لە ئاستی گەلێکی سەربەخۆدا بێت خاوەن  مێژوو وزمان‌و خاکی خۆیەتی‌وەك هەموو گەلانی‌تر.

سەبارەت بە  پەیوەندی نێو دەوڵەتی لە قۆناغی ئێستادا وەگۆرانکارییە دوا رۆژییەکان لە  قۆناغی داهاتوودا پێویستە هەوڵ بدرێت بۆ بەدەست هێنانی رای گشتی جیهان بۆ کێشەکە، ئەمەش لە رێگای گەران بە دوای  شێوازە یاساییەکان‌و دیموکراسیەکان، بە رێگەی ئاشتی وە بەشداری نێو دەوڵەتی بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی عادیلانەی هەمیشەیی، لە چوار چێوەی پرەنسیپەکانی یاسایی  نێو دەوڵەتی کە مافەکانی مرۆڤ ریك دەخات لەسەر بناغەی دیموکراسی‌و ویستی سەربەستی گەلان ئەمە لە لایەکەوە،  لەلایەکی‌ترەوە دەبێت ئەو راستیە بزانین کە چارەسەر کردنی کێشەکەمان دوو لایەنی هەیە: (لایەنی سیاسی-لایەنی ئابووری). کە پێویستە هەردوو لایەنەکە بەیەکەوە بە  شێوەیەکی هاوتاو تەواو لە گەشەکردندا بن بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی کە دەمانەوێت. وپێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ئەو گۆرانکاریانەو تازە گەریانەی لە گۆرەپانی نێو دەوڵەتیدا بوونە هۆی دۆزینەوەی رژێمێکی جیهانی نوێ کە مامەڵە لەگەڵ مەسەلەی کوردا دەکات.

بەڵام نەك لەسەر بناغەی مەسەلەیەكی نەتەوەیی سەربەخۆ، بەڵكو بە مەسەلەیەكی ناوخۆیی دادەنێت. كە دەبێت لە چوارچێوەی مافەكانی مرۆڤ و بەڵگەنامە نێو دەوڵەتیەكاندا چارەسەر بكرێت كە بڕیارەكانی ٦٨٨ی ئەنجومەنی ئاسایش بۆ پاراستنی مافە مەدەنیەكان لە عێراقدا دەگرێتەخۆ.

بەڵام ئەمە وا لە كورد ناكات كە بێهیوا بن لە بەدیهێنانی ئامانجەكانیاندا، بە پشت بەستن بە پێوانە یاساییە نێو دەوڵەتیەكانی‌تر، كە بوونی سەربەخۆیی وە بوونی نەتەوەیی خۆی پێبپارێزرێت، كە داوای دیاری كردنی مافی چارەی خۆنووسین و یەكسانی بكات لە چوار چێوەی دەوڵەتی عێراقدا. ئەمە لە كاتێكدا هەموو روانگەی هەرێمایەتی زۆربەی زلهێزەكان دژی جیابوونەوەی كورد، خۆیان وتەنی پارچە پارچە كردنی عێراقن.

كەواتە كورد دەتوانێت سود لەو ڕێكەوتننامە نێو دەوڵەتیانە وەربگرێت، كە لە ساڵی ١٩٦٦دا ئیمزاكرا كە پەیوەنتدی بە مافەكانی مرۆڤەوە هەیەو مافە سیاسی‌و ئابووری‌یەكانیان دیاری دەكات.

لە مادەی یەكەمدا ئاماژە بۆ ئەوە دەكات مافی هەموو گەلێكە كە چارەنووسی خۆی دیاری بكات، هەروەها بە سەربەستی بارودۆخی سیاسی خۆی دیاری بكات، وزۆر بە جدی هەوڵ بدات لە پێناوی گەشە كردن و پێشكەوتنی ئابوری‌و رۆشنبیری‌و كۆمەڵایەتی‌دا.

ئەگەر پشت بەم دەقە ببەستین، ئەوا بە پێی یاسا كورد بۆی هەیە كە داوای مافی چارەی خۆنووسینی خۆی بكات لە بەڕێوە بردنی كاروباری خۆی‌دا. وەك ئاماژەمان بۆ كرد داواكاری "فدرالیەت" داوكارییەكی رەوایە، وە كێشی گەورەی دەبێت ئەگەر هاتوو ئەو كەمینە نەتەوەییانەی داوای یەكسانی دەكەن كە ژمارەی دانیشتوانیان گونجاو بێت. پێویستە ئەو راستی‌یە بیر بخەینەو كە كێشەی كورد كێشەی مەسەلەی مافی كەمایەتیەك نی‌یە بەڵكو لە بناغەدا مەسەلەی دابەش

کردنی مافی بوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆیی‌یە لە گەلی کورد لەلایەن وڵاتە کۆلۆنیالیستەکان و هاوپەیمانەکانیان لە ناوچەکەدا هێنراوەتە کارەوە.

چونکە ئەو راستی‌یەی نکۆڵی ناکرێت کورد کەمایەتی نی‌یە، بەڵکو گەلێکی سەربەخۆیە خاوەن زمان و کەلتورو مێژوو خاکی خۆیەتی خەسڵەتی رەسەنایەتی رەگی داکوتاوەو بە درێژایی مێژوو لەسەر خاکی خۆیدا ژیاوە لە هیچ شوێنێکەوە بۆی نەگوێزراوەتەوە بەڵکو بە پێچەوانەی تورکەکان کە خاوەن زەوی خۆیان نین بەڵکو بەهۆی کۆچ کردنەوە بۆ ئەنادۆڵ لە نیوەی سەدەی یازدەیەم لەو شوێنانەدا نیشتەجێ بوون.

داواکاری مافی چارەی خۆنووسین بە هیچ جۆرێك مەبەست لە ئۆتۆنۆمی نی‌یە، لەبەر ئەوەی ئەم چەمکە چەمکی مافی چارەی خۆنوسین فراوانترە بەڵکو فیدراڵیەت و سەربەخۆ بوون دەگرێتەوە. دەتوانین بڵێین:

داواکاری فیدراڵیەت لەم قۆناغەدا بە یەکێك لە دەسکەوتە مەزنەکانی گەلەکەمانی دابنێین لە دوای راپەرین، بەڵام نابێت دوا دەسکەوت بێت و توشی بەستەڵەکی عەقڵی و کردەیی ببین. دەبێت پێش رووداوەکان بکەوین بە فریای خۆمان بکەوین لەگەڵ ئەوەشدا فیدراڵیەت ئەگەر لە ژێر چاودێری نیو دەوڵەتی‌دا بێت و سەرپەرشتی بکرێت دەتوانین ئەمە بە هەنگاوێك دابنرێت بەرەو سەربەخۆ بوون. بە پێچەوانەی ئۆتۆنۆمی چارەسەرێکی ناوخۆییە وە هەرکاتێك بێت بە گۆرانکاری دەستوری لەلایەن دەوڵەتی ناوەندەوە دەتوانین رەتی بکاتەوە.

ئێستا بارودۆخی نێو دەوڵەتی گۆڕاوەو کێشەی کورد بۆتە کێشەیەکی دیار لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیدا هەرچەندە کێشەی کورد لە کوردستانی عێراقدا وەك کێشەیەکی ناوخۆ ولە میانەی یەکێتی خاکی عێراقەوە سەیر دەکرێت، دەبێت ئەم تەلیسمە بشکێنرێت "بەڵام ئەوەی جێگەی سەر سوڕمانە حیزبە سەرەکیەکانمان

زیاتر لە هەموو کەس پشتیوانی خۆیان بۆ یەکێتی خاکی عێراق دووبارە دەکەنەوەو دەڵێن دژی جیابونەوەیان".

هەر چۆنێک بێت ئەو بڕیارو دەست تێوەردانی نەتەوە یەکگرتووەکان، دەتوانین بڵێین خەسڵەتێکی تایبەتی داوە بە مەسەلەکەمان، بەڵام تاچ رادەیەک گەشەی پێ دەدرێت ئەمە دەگەڕیتەوە بۆ خۆمان. لە رووی یاسا نێو دەوڵەتیەکانەوە کێشەی کورد پێشینەی هەیە لەوانەش پەیماننامەی سیڤەر وە هەردوو بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ٦٨٨وە بڕیاری ٩٨٦. هەرچۆنێک بێت مافی رەوای گەلی کوردە کە داوای دیاری کردنی چارەنوسی خۆی بکات وە دەبێت لەلایەن کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیەوە پشتگیری لێ بکرێت.

وەلە حاڵەتێکدا ئەگەر ئەم پشتیوانیەی بەدەست نەهێنا لەدیاری کردنی مافی چارەی خۆنووسین دا ئەوا ئەو کاتە دەتوانین پەنا بۆ رێگایەکی تری یاسایی بەرین کە ئەویش لە بواری مافەکانی مرۆڤدا بڵاوە.

لەبەر ئەوەی بەرێگایەکی دیموکراسیو شەرعیدادەنرێت لە چارەسەر کردنی کێشە نەتەوەییو هەرێمایەتیەکاندا بە شێوەیەکی دیموکراسیانە ئەویش لە رێگەی هەڵسان بە ریفراندۆمێکی سەربەستانەیە کە لە ژێر چاودێری نێو دەوڵەتیدا بێت. وەیان دەبێت بە رەزامەندی دەسەلاتی حکومەتی ناوەندی وەربگیرێت وەیان بە رێکەوتن لە گەڵیدا دەبێت کە چۆن شێوازی بەرێوە بردنی هەرێمەکە دیاری بکرێت بەو چەشنەی کە ئێستا ولاتانی جیهان لە هەندێ شوێندا پەیرەوی دەکەن، وە ئەگەر هاتوو ئەم رێگایەش دژایەتی کراو رەتیان کردەوە، ئەوا ئەو کاتە راپرسی- ریفراندۆم لەلایەن دەسەلاتی بەرێوە بردنی هەرێمەکەوە بەرێوە دەبرێتو خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری دەکەن.

# کۆتایی

....................

دەتوانین پشت بە بەڵێننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ببەستین کە ئاماژە بۆ مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە سەرەکیەکان دەکات جەخت لەسەر پرەنسیپی نمونەیی و ئاستێکی ئەخلاقی دیاری کراو دەکات کە دەبێت دەوڵەتی ئەندام لەو ئاستەدا بن وەك دەزانین دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان لە هیچ پارچەیەك لە پارچەکانی کوردستان ئەمە پەیڕەو ناکەن نەك تەنها ڕێز لە مافەکانی مرۆڤ ناگرن بەڵکو بە دڕندەترین شێوە دژی داواکارییەکانی گەلی کورد وەستاون و هەموو مافێکیان زەوت دەکەن.

مافی چارەی خۆنووسین ئێستا بەیەکێك لە بنەما سەرەکی یەکان دادەنرێت، کە ئەرك و ماف دەخاتە ئەستۆی هەمو دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگکرتووەکان دەبێت پابەند بن پێوەی لە ڕێگەی دەست بەکاربونیانەوە بەتەنها بێت وەیان بە شێوەیەکی هاوبەش بێت لەگەڵ ڕێکخراوە نیو دەوڵەتیەکاندا بۆ داننان بەم پرەنسیپەدا بۆ ئەو گەلانەی کە دەکەونە ژێر دەسەلاتیانەوە.

کورد دەتوانێت پشت ببەستێت بە بڕیارەکانی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان وەك روونمان کردبۆوە "کەسیفەتی ملزم" پابەند بوونیان هەیە وە زۆربەی وزۆری ئەم بڕیارانە بەسەر دەوڵەتاندا پراکتیك کراوە، وەتوانیان سەربەخۆیی خۆیان بەدەست بهێنن.

ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ سیستەمی بە دیموکراتیزە کردن لە کۆمەڵگای نێو دەوڵەتی خەسڵەتی شارتانیەت و پێشەکەوتنی دەوڵەتان دەنوێنێت، وە ئێستا ولاتان ناتوانن نارەزایی دەربڕن و خۆیان دورە پەرێز بگرن لە پراکتیك کردنی ئەم پرەنسیپەدا بەوەی کە تایبەتمەندە بە (کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتەوە) بۆ لاتانی

تر نی‌یه داوایان لیّ بکریّت، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئیّستا ده‌ستوری نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان به هه‌موو دام‌و ده‌زگاکانیه‌وه به به‌رده‌وامی ره‌تی ئه‌وه ده‌کات که تایبه‌ت بیّت به پسپۆریه‌تی‌و کاروباری ناوخۆوه.

چونکه هه‌ندیّ له‌و مافانه‌ی که جاڕدانی جیهانی ده‌یان گریّته خۆی، به تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی که په‌یوه‌ندی به مافی ژیان‌و سه‌ربه‌ستی تاکه که‌سی وه سه‌ربه‌ستی به‌کارهیّنانی زمان‌و...هتد هه‌یه به به‌شیّك له سایای عورفی نیّو ده‌وڵه‌تی داده‌نریّت..

وه مه‌به‌ست لیّ یان پاراستنی مافه‌کانی مرۆڤ‌و ئازادییه سه‌ره‌کیه‌کانه ده‌بیّت ئه‌م مافانه له‌به‌رچاو بگیریّت.

داگیرکه‌رانی کوردستان به نکوڵی کردنیان له مافه‌کانی گه‌لی کورد: جه‌خت له‌سه‌ر ئه‌وه ده‌که‌ن که ئاره‌زوو ناکه‌ن بۆ چاره‌سه‌ر کردنی کیّشه‌کان‌و بڵاوبونه‌وه‌ی ئاشتی نیّو ده‌وڵه‌تی، ئه‌مه خۆی له خۆیدا به‌ڵگه‌یه له پیّشیّل کردنی یه‌ڵیّننامه‌ی نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان به‌پیّ‌ی ماده‌کانی "٥٥-٥٦" له به‌ڵیّننامه‌که. ئه‌گه‌ر ریّز گرتن له مافه‌کانی مرۆڤ یه‌کیّکه له مه‌رجه سه‌ره‌کیه‌کانی‌و پیّداویستیه‌کانی ئاشتی هه‌میشه‌یی له ناوچه‌که‌داو له جیهاندا، ئه‌وا پیّویسته له‌سه‌ر نه‌ته‌وه یه‌کگرتووه‌کان‌و ده‌وڵه‌تانی ئاشتیخوازی جیهان پشتگیری خۆیان‌و داکۆکی کردنیان له‌م پره‌نسیپه فراوانتر بکه‌ن‌و وه پیّش که‌ش کردنی "ظمانات" پیّویست بۆ ریّز لیّ گرتن‌و پراکتیك کردنی ئه‌م مافانه له لایه‌ن ده‌وڵه‌تانی داگیر که‌رانی کوردستان.

وه فشاریان بخریّته سه‌ر به هه‌موو شیّوازیّك له پیّناوی به‌رقه‌رار کردنی ئاشتی‌و کۆتایی پیّ‌هیّنانی ناکۆکیه‌کان وه‌ستاندنی هه‌موو سیاسه‌تیّکی ره‌گه‌ز په‌رستانه دژی کورد که به ئاشکراو به دیارچاوی جیهانه‌وه ده‌رهه‌ق به کورد ده‌کریّت.

پێویستە مەسەلەی کورد تەکانی گەورەی پێبدرێت زیاتر بەرەو پێش ببرێت وەکێشەی کورد لە چوارچێوەی کێشە ناوخۆیەکان دەربهێنرێت بەڵکو وەك کێشەی میللەتێکی ماف خوراو بخرێتە روو کە مافی رەوای خۆیەتی داوای دیاری کردنی چارەنوسی خۆی بکات. لەسەر ئاستی جیهاندا دەبێت یەکێك یان زیاتر لە دەوڵەتانی ئەندام لە نەتەوە یەکگرتووەکان بە رەسمی داوای سەیر کردنی مەسەلەی کورد بکرێت لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشەوە، دەبێت ئەنجومەنی ئاسایش وا دابنێ کە کورد گەلێکی ژێر دەستەیە، وە دەبێ بەپێی بەڵێننامە نەتەوە یەکگرتووەکان مافی بدرێتێ، بەڵام لە هەمووی گرنگتر دەبێت ئەم دەست پێشخەرییە لە کورد خۆیەوە بێت (دەبێت کورد بڕوای تەواوی) بە مەسەلەکەی خۆی هەبێت وە هەنگاوی ئازایانە بنێت تەلیسمی ترسی هەرێمایەتیو دوژمنایەتی کردنی لە لایەن دەوڵەتانی داگیرکەرەوە بشکێنێت. کورد لە چوار لاوە بە دوژمن دورە دراوە، وە لە هەوڵی بەردەوامدان بۆ سڕینەوەی ناسنامەی کوردو گەورەترین مەترسیان بوونی قەوارەی کوردی‌یە لە باشوری کوردستان، لە هەوڵی چڕو چڕدان بۆ سەر نەگرتنی حکومەتی هەرێمو شکست پێهێنانی لە لایەن داگیر کەرانەوە، کۆبونەوە چوار قۆڵیەکانی عێراقو ئێرانو تورکیاو سوریا پاشان دوای راپەرین بە ئاشکرا کۆبونەوەکانی خۆیان ئەنجام دا، کە بێگومان مەسەلەی کورد تەوەری سەرەکی کۆبونەوەکانیانن کۆبونەوەی ساڵی ١٩٩٢ پاشان کۆبونەوەی ساڵی ١٩٩٤دوا کۆبونەوەیان لە ١٩٩٩/٢/٨ کە تەوەری سەرەکی وتووێژەکانیان دژایەتی کردنی حزبی دیموکراتی ئێرانو مەسەلەی بوونی (PKK)، وە لە هەمووی گرنگتر یەك بوونی یان یەك پارچەیی خاکی عێراقو پاراستنی سەروەری خاکەکەیەتی، لە عەرەب دڵسۆزتر خۆیان نیشان دەدەن. وەك بونی قەوارەی کوردی پارچە کردنی نیشتمانی عەرەب بێت..

سستی مەسەلەی کورد لە ئاستی نێو دەوڵەتی‌دا دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی پشتیوانی گەلی کورد ئەگەر ئێستا هەبێت "تحفظات" زۆر دەکەن و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نی‌یە چونکە هیچ دەوڵەتێك تا ئێستا ئامادە نین بەرژەوەندیە ئابووری‌و سیاسی‌یەکانیان بخەنە مەترسی‌یەوە لەگەڵ دەوڵەتانی ناوچەکەدا. کەواتە پێویستە لەسەر ئاستی ناوخۆدا زیاتر مەسەلەی کورد "تەکانی" پێ‌بدەین، دەبێت خۆمان بزانین چیمان دەوێت، ئەوەی دەمانەوێت بیکەین بە "دیفاکتۆیەك"بەسەر باری ئێستای ناوچەکەو جیهاندا بسەپێنین، کورد دەبێت خۆی چارەنوسی خۆی دیاری بکات دەبێت سوود لە مێژووی پڕ لە خوێناوی‌مان وەربگرین.

گەورەترین هەڵەی کورد سوود وەرنەگکرتنی لە مێژووە وە یان زۆر کەم بە دەگمەن سود لە مێژووی خۆی وەردەگرتن وەزۆر زووش رابردوو لە یاد دەکات، ڕاستە زۆر دەرفەتی چاکمان لە کیس چووە زۆر جاریش نەتوانراوە ئەو پشتیوانیەی لە گەلەکەمان کراوە دوای ڕاپەڕین بە باشترین شێوە بقۆزێتەوە. شەڕی ناوخۆ گەورەترین ماڵوێرانی‌و مەترسی لە دەست چوونی دوا تاقیکردنەوەی کوردی لەگەڵ خۆیدا هێنا بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا:

ئێستاش ئەوەندە دەرفەت لەبەردەم گەلەکەماندا ماوە کە بتوانرێت ئامانجەکانی بهێنێتە دی. کورد دەبێت ڕێکخراوی سیاسی یەکگرتووی هەبێت گەر بیەوێت گەورەتریت کاریگەری هەبێت لە گۆڕەپانی نێو دەوڵەتی‌دا.

کورد پێویستی بە خەباتی هاوبەش‌و یەك ئامانج‌و هەوڵ‌و کۆششی یەککگرتوو هەیە. نابێت کورد چاوەڕوان بکات شتی بۆ بکرێت "واتە سەربەخۆیی لەسەر سینی زێڕ پێشکەش بکریت لە وەهمدا بژی.

دەبێت خودی خۆی بسەلمێنێت، کێ‌یە؟ ناسنامەی چی‌یە؟ وە شیوازی حوکم کردنی خۆی بە سەربەستانە هەڵبژێرێت.

پێویستمان بە گۆڕینی ستراتیجیەتی حزبەکانمان هەیە هەر لە ئامانج و شێوازی خەبات و مامەڵە کردنیاندا نابێت دڵی داگیرەرانی کوردستان لەسەر حسابی بەرژەوەندییە باڵاکانی گەلەکەمان رابگیرێت. نابێت ئامانجەکانمان بکەینە قوربانی لە پێناوی لێ زویر نەبوونی داگیر کەران.

کورد پێویستی لە نیەت پاکی هەموو لایەنە سیاسیەکان هەیە بەرامبەر بەمەرام و ئامانجەکانی. پاش کۆتایی پێهێنانمان لە باس کردنی مێژووی چەوساندنەوەو زوڵم لێ کردنی کورد لە لایەن وڵاتە زلهێزەکان و داگیرکەرانی کوردستانەوە.

ئەمە سەرەرای زوڵم لێ کردنی کورد لە خۆی کە ئەوەندەی تر برینی جەستەی پارچە پارچە کراو قوڵتر دەکات. زیاتر بێ بڕوایی و بێ ئومێدی لە لای جەماوەر بەرجەستە دەکات.

لە کۆتایی توێژینەوەکەدا دەڵێم..

-کەی بێت ئازاری میللەتەکەم کۆتایی پێبهێنرێت وەك هەموو میللەتانی جیهان خاوەن سەربەخۆیی و ئازادی خۆی بێت و رۆژگارێکی نوێ لە کورد هەڵبێت. کەی بێت عەقڵی کورد لە ئاست گەورەترین لێپرسراوێتی و ئەمانەتی مێژوویدا دەبێت.

-خۆزگە هەموومان لە ئاست بەر پرسیاریدا دەبوین بەرامبەر بە گەلەکەمان.

ئێستا... سەرەتای دەست پێکردنی مێژوویەکی نوێیە. سەرەتای... مەرامی نوێ و ئامانجی نوێ و دەروون و نیەت پاکی نوێیە.. بۆ رۆژێکی پرشنگدار دەبێت ئەم جارەیان..لە سبەینێیەکی نزیك دا مافی چارەی خۆنوسینی کورد لە کوێدا لەنگەر بگرێ؟

# پەراوێزەکان

أ-شارل مونتکبو (١٦٨٩-١٧٥٥)، فەیلەسوف و مێژوونوسی فەرەنسی، وزانستی سروشتیەکانی خوێندووە، کتێبی زۆری داناوە، گرنگترینیان بە ناوی "روح القوانین"

ب-(Immanuel Kant) فەیلەسوفی ئەڵەمانی لە شاری کوینسبێرنگی ئەڵەمانی لە دایك بووەو دامەزرێنەری "الاخلاق المیتافیزیقیە". دادەنرێت.

ج-نیشتمان پەروەرەکان "الوطنیون"بە مانای جەماوەری رۆمانی دێت بە تایبەتی سەربەستەکان ئەوانەی کۆیلە نەبوون.کە ولاتەکەیان خۆش دەویست، مێژوو لەلایان مێژوی رژێمە سەربەستەکانە نەك گەلیەکان.

وە پێوەری حکومەت لەلایان بە پێی سودەیە کە هاوولاتی بە دەستی دەهێنێت لە حکومەت، بە بێ گوێدان بە جۆری ئەو حوکمەی کە حوکمی پێ دەکات.

ئەمانە ناویان لێنابوون "هاوولاتیە جیهانیەکان یان نیشتمان پەروەرە جیهانیەکان" بەوە ناسرا بوون کە گرنگیان بە فێر بوونی فەلسەفەی لوك و مونسیکو دەدا، ئەمە جگە لەوەی بڕوای تەواویان هەبوو بە دەستورو ئازادییان دەپەرست، کە لە هەموو شتێك زیاتر بەلایانەوە باشتر بووە.

سەبارەت بە نەتەوەییەکان "القومیون" ئەمانە بەلایەنگرانی جان جاك رۆسۆ دادەنران، وە بڕوایان بە رۆحی کۆمەڵ و بوونی قەوارەی سیاسی گەل هەبوو بە پلەی یەکەم پشتیان دەبەست بە هەڵبژاردەی (اختیار) مرۆڤ خۆی وەخواست و ئارەزووەکانی، جا ئەگەر ویستی مرۆڤ هاتە دی، ئەوا ئەو کاتە بەرژەوەندییەکان وا پێویست دکەات بە بوونی قەوارەیەکی سیاسی وە دەبێت ئەم قەوارەیەش بێتە دی.

له سەرەتادا ناکۆکیەکان زۆر بە ئاشکرا هەستی پێدەکرا لە نێوان ئەوانەی خۆیان بە نیشتمان پەروەر دادەناو ئەوانەی کە خۆیان بە نەتەوەیی دادەنا، ناکۆکیەکان توند بوو بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا تێبینی ئەوە دەکرێت زۆربەی ئەوانەی کە نیشتمان پەروەرە جیهانیەکان دەناسران پاشان دەگۆران بۆ نەتەوەییە توند ڕەوەکان وەك شۆڕشگێرە فەرەنساییەکان کە لە سەرەتادا دەستیان کرد بە رزگار کردنی خۆیان بە سەربەستی خۆیان بەدەست دەهێنا کەوتنە دەست بە سەرا گرتنی سەربەستی ئەوانەی تر لە ژێر پەردەی رزگار کردنیاندا.

وە بەهەمان شێوەش لەلای نەتەوەییەکان پاش بەدیهێنانی سیستەمو بێزار بوون لە سیستەمە ناوخۆییەکان بەڵکو دەگەران بە دوای فیدراڵیەت یان یەکبوونێکی گەورە پێك بهێنن بۆ بەدیهێنانی مانای ئازادییە سیاسیو ئابووری‌یەکان. وە سەبارەت بە مافی چارەی خۆنوسین داواکارییەکە پەیوەندی بە دادوەری سیاسیو لە هەمان کاتدا زەبرو ستەمی سیاسی‌یەوە هەیە، هەر چۆنێك بێت بوونی ئەم داواکارییە پەیوەستە بە ویستی کۆمەڵەوە هەرچیەك بێت پاڵپێوەنەرەکانی.

د-هارولد لاوسکی: یەکێك لەوانەی کە کۆمەڵەی "الفابیە"و لە حزبی کرێکارانی بەریتانیانی کاری کردووە مامۆستای رامیاری بووە لە کۆلیژی "ئابووریو رامیاری" لە لەندەن، وە زۆربەی بۆچوونەکانی لە کتێبی "الایمانو العقل المدنیه" رەنگ دەداتەوە.

١.بڕوانە: مبدأ تمرير المصر والعرب، تأليف زهير عطيه لە (الانسایکلۆ البريطانيه-المجاد لندن-١٩٥١)وەر گرتووە.

٢.شبات فواد: الحقوق الدوليه العامه طبع الجامعه السوريه-دمشق ١٩٥٦.

٣. بروانــه: مبــدأ تقريــر والمصــر والعــرب: تــأليف زهــير عطيــه لــه الانسايكلوبيديا-العلوم الاجتماعيه شركه ماەلان نيورك المجلد ١٣اسـنه ١٩٣٤، وەرگرتووە.

٤. مبدأ تقرير والمصـر والعـرب: تـأليف زهـير عطيـه شـركة الرابطـة للطبـع والنشر بغداد ١٩٥٩.

٥.(Plecbeions- Plebs) ئەمانـە زۆرینـەی گـەلو كەسـانی هـەڵبژاردە لـە لايـەن گەلـەوە دەگرێتـەوە وشـەوی (Plebicite) مانـای (اسـتفتاء-راپـرس)ی لیٚ وەرگیراوە.

٦.بڕوانـە: تقريـر المصـر (دراســه مقارنــه فى التــاريخ والقــانون والاقتصــاد والمجتمع الدولى) تاليف حسين على الجيشى.

٧.بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٨.بڕوانە: الامم والتقديم الاجتماعى. تاليف كوليشينكو-دار التقدم موسكو.

٩.بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٠.بڕوانـە: مسـأله الامـه وحقتقريـر المصـير. تـأليف بيايـنـا مـودر جينمكايـا ترجمه: رفعت السعيد.

١١.بروانه: المارسيةوالالمسألة القومية. تأليف: جورج طرابيشـى-منشـورات دار الاداب بيروت. الطبعة الاولى-تشرين الثالي ١٩٦٩.

١٢.بڕوانە: يەكێك لە (اطروح)ەكانى لينين لە ژێر ناونيشانى الثورة الاشتراكيه وحق الامم فى تقرير مصيرها.

١٣.بڕوانـە القوميـه فـى التـأريخ والسياسـه فدريـك هزتـز-دار الكـاتب العربـى-القاهره.

-بۆ تێگەیشتن لە چەمكی رۆڵـی گـەل وەك دروسـت كـەری مێژوو پێویسـتە یەكەمجار ئەوە دیاری بكـەین كـە مەبەسـت لـە گـەلو جـەماوەرە تێكۆكـەی چـی

دەگەیەنێت. ناتوانین بڵێین کە مەبەست لەگەل شتێکی جێگیرەو لە دەرەوەی مێژووە. یەکجار دیاری دەکرێت هەتا سەر دەبێت.

گەل یەکەم جار هێزی کارکەر دەگرێتەوە وە لە کۆمەڵگای چینایەتی‌دا زۆردارو (مستغل)کان دەگرێتەوە وە لە کۆمەلچگای سەرمایەداری‌دا رێکارو جوتیارو رۆشنبیران‌و چینەکانی تریش دەگرێتەوە کە کاردەکەن بۆ گەشە کردنی کۆمەلایەتی. لە کۆمەڵگای سۆیالیستی‌دا گەل هەموو دانیشتوان دەگرێتەوە، هەر لە چینی کرێکارانەوە تا دەگاتە رۆشنبیران‌و جوتیاران.

١٤. بڕوانە: لینین (مسائل السیاسە القومیەو الاممیە البرولیتاریە). ترجمە الیاس شاهین دارالتقدم مۆکسکو.

١٥.بڕوانە: أسس الفلسفە الماركسیە. تألیف ف. أڤاناسییف-ترجمە عبدلرەزاق صافی.

١٦.بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

١٧.بڕوانە لینین (حق الامم فی تقریر مصیرها).

١٨.بروانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

**ئەم گۆڤارە دەست لینین کەوتووەو خوێندویەتیەوە خۆی باسی لێوە دەکات.

١٩.بڕوانە: أسس الفسلفە الماركسیە. تألیف:ف. اڤاناسییف، ترجمە: عبدالرزاق الصافی.

٢٠.بڕوانە تقریر المصیر "دراسە مقارنە فی التأریخ‌و القانون‌والاقتصادوالمجتمع الدولی. تألیف.جسین علی الجیشی دار الکاتب العربی.

٢١.بروانە الحقوق الدولیە العامە تألیف: شباط فواد ١٩٥٦ل.

*بەتایبەتی سەرۆك "ولسون Wilson"کە بانگهێشتی بۆ ئەوە دەکرد دەبێت دان بە مافی میللەتاندا بنرێت لە دیاری کردنی چارەنوسیاندا ولسون لە دەربڕینی

هەڵوێستەکاندا هەڵوێستی وڵاتەکەی دەردەبڕی پاشان سەرەك وەزیرەکانی تریهاوپەیمانان هەمان هەڵوێستیان وەرگرت. سەرۆك ولسون لە شباتی ١٩١٨ لەبەردەم کۆنگریسی ئەمەریکیدا رایگەیاند مافی چارەی خۆنووسین تەنها دەربڕین نییە بەڵکو پێویستە کاری تەواوی بۆ بکرێت، وەناتوانین خۆمانی لیٚ گێل بکەین چونکە ئەرکی سەرشانمانە.

٢٢.رێسای ئینتداب: دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی رۆمانیەکان کە لە یاسای تایبەتدا بەکاریان هێناوە، پاشانیش هاتە ناو یاسا نێو دەوڵەتیەکانەوە.

٢٣.بڕوانە: اصول علم السیاسە: الدکتور محەمەد تەها البدوی، ١٩٦٠.

***رای گشتی بۆ چونێکی زۆر کۆنە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی یۆنانیەکان کە هەموویان کۆ کرد بۆوە لە وشەی (Ossa, Pheme) هەروەها رۆمانەکان لە نای (Fama- Popularis) بەڵام بۆچوونە تازەکەی ئەم وشەیە دیاری نەکرا تا سەدەی هەژدەیەم، هەتا رووناکبیرێکی وەك (لۆك) لەساڵی ١٦٩٠رای گشتی ناوبردووە وەك یەکێك لە یاساکان کە مرۆڤ پێویستە بۆی بگەرێتەوە لەگەڵ یاسا خواییەکانو یاسای شارستانێتی.

٢٤.بڕوانە المسأله الکردیه فی العراق ال ١٩٦١-تألیف:ماجد عبدلرەزا.

٢٥.بڕوانە: الکرد والسأله الکردیه. شاکر خصباك. بغداد ١٩٥٩.

٢٦. پێویستە ئامازەبۆ ئەوە بکەین کە یەکەم دابەشکردنی کوردستان لە نێوان سوڵتانی عوسمانی موورادی چوارەمو شی ئێرانی عەباسی سەفەوی بە پیٚی پەیماننامەی ساڵی ١١٣٩ کە کاریان پیٚدەکرد هەتا ساڵی ١٨١٣دا.

٢٧.بڕوانە: المسأله الکردیه فی العراق الی ١٩٦١ تالیف. ماجد عبدالرزا، منشورات بغداد مطبعة دار الحاجط.

٢٨. بڕوانە محاضرة (المستر س ج أدموندس).عن المشکله الکردیه ١٩٦٦.

٢٩.بڕوانه الفدراليه الكردستانيه‌و التوقعات المستقبليه (دراسه قانونيه) تأليف د.سربست توفيق كوبنهاجن، ١٩٩٥.

٣٠.بڕوانه هه‌مان سه‌رچاوه‌ی پێشوو.

٣١. جه‌نه‌راڵ شه‌ريف پاشا كه له پاريس نيشته‌جێ بوو ئه‌و نوێنه‌ری كورد بوو له كۆنگره‌ی ئاشتی له ساڵی ١٩١٩وه له ساڵی١٩٢٠دا دوو ياداشت نامه‌يان له‌گه‌ڵ دوو نه‌خشه‌ی كوردستانيان پێشكه‌ش به كۆنگره‌كه كرد كه داواكارييه‌كانی گه‌لی كوردی ده‌گرته خۆ سه‌باره‌ت به داواكاری كورده‌كان بۆ سه‌ربه‌خۆ بوونی وڵاته‌كه‌يان.

٣٢.دابه‌شكردنی كوردستان له‌دوای جه‌نگی جيهانی يه‌كه‌م بناغه‌ی ئه‌م دابه‌شكردنه ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ساڵانی جه‌نگ ئه‌و كاته‌ی ئينگليزو فه‌ره‌نساييه‌كان له ساڵی ١٩١٦دا ڕێكه‌وتن له‌سه‌ر چۆنيه‌تی دابه‌شكردنی ناوچه‌ی ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست به پێی ڕێكه‌وتنێكی نهێنی له ١٥-١٧ی مايسی ١٩١٦دا كه‌به ريكه‌وتنی سايكس بيكۆ ده‌ناسرێت.

٣٣.هيچ گومان له‌وه‌دا نی‌يه كه هاوپه‌يمانه‌كان زۆر لايه‌نگری ئه‌رمه‌نه‌كان بوون له‌به‌ر ئه‌وه‌ی مه‌سيحی بوون هه‌رچه‌نده ژماره‌يان مليۆن‌و نيوێك ده‌بوون ئه‌مه له كاتێكدا كه چوار ولايه‌تی سه‌ره‌كيان كه كوردی بوون ژماره‌ی دانيشتوانی كورد دوو ئه‌وه‌نده‌ی ئه‌رمه‌نه‌كان ده‌بوون.

٣٤.بڕوانة القضية الكرديةوالقومية العربية في معركة العراق، تأليف. محمود الدرة-در الطليعة بيروت الطبعة الاولى ١٩٦٤.

٣٥.بڕوانه: المساله الكريه فى العراق الى ١٩٦١، تاليف ماجد عبدلرضا- منشورات مكتبه بغداد.

٣٦.كه په‌يماننامه‌ی فرسای كرا بۆ ڕێكخستنه‌وه‌ی په‌يوه‌ندی نێوان ده‌وڵه‌تانی به‌شدار بوو له شه‌ڕدا، دوای شه‌ڕ كه ئامانجيان سزادانی توركيا بوو كه

پاڵپشتی ئەڵەمانیا بوو. ئەویش لە ڕێگەی دابەشکردنی لە (٤-٥)هەزار کم٢ لە ڕووبەرەکەی.

دکتۆر سەربەست تۆفیق دەڵێت:

هەڵەی دیبلۆماسیەتی ڕۆژئاوا لەوەدا بوو کە گۆڕانکارییە ناوخۆییەکانی ناو تورکیای لەبەرچاو نەگرتووە، بۆ نمونە هێزو کاریگەری "کەمال ئەتاتورك" کە بەهێزترین بەڵگە بوو بۆ پێشبینیەکانی دوا ڕۆژ لە دیاری کردنی حەزی تورکی بۆ بەهێز کردنی پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا. کە ئەمە خۆی لە خۆیدا هەنگاوێکی دژانە بوو کە ڕۆئاوا بە تەواوی بەرپەرچی دەدایەوە. چونکە تورکیا لەلایان بە هاوپەنێکی گرنگیان دادەنا دژی یەکێتی سۆڤیەت کە سوپای تورکی تەنها هێزە لە جیهاندا بتوانێت ڕێگرێك بێت لە ڕێگەی بەلشەفیەت، وە هەر ئەم هۆکارە بوو کە پەیماننامەی سیڤەری شکست پێهێنا.

٣٧.بڕوانە پەیمانی سیڤەر لە سیاسەتو یاسای نێو دەوڵەتاندا نوسینی دکتۆر مارف عومەر گوڵ. سیاسەتی دەولی -ژمارەی (١)ساڵی ٥نیسانی ١٩٩٦.

٣٨. بڕوانە المسأله الكرديه فی العراق الی ١٩٦١ تأليف ماجد عبدلرضا منشورات مكتبه بغداد.

*دکتۆر مارف عومەر گوڵ دەڵێت: ئەو کۆمسیۆنەی کە پێك هات کۆمسیۆنی ئەستەمبوڵ هەتا شەش مانگ دوای مۆر کردنی ئەو پەیماننامەیە، ئەو کۆمسیۆنە نەهشەیەك بۆ ئۆتۆنۆمی ئیقلیمی ئەو ناوچانە پێشکەش دەکات کە زۆربەی دانیشتوانیان کوردە. کە کەوتونەتە ڕۆژهەڵاتی چۆمی فورات و خوارووی ئەرمەنستان یان کەوتونەتە باکوری سنوری نێوان تورکیا و سوریا و میسۆپۆتامیا وەك لە بڕگەکانی (٢٧-١١-٢-٣)دا هاتووە، ئەگەر کۆمسیۆنەکە بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی وەرنەگرت هەر کام لە ئەندمانی کۆمسیۆن مەسەلەکە لەگەڵ حکومەتی خۆی دێنێتە گۆڕێ.

٣٩.مادەی (٢٢): دەربارەی ئەو سنورانەیە کە پێشتر سەربە ئیمپراتۆیەتی عوسمانی بوون، بۆ ئەوەی بتوانن کاروباری خۆیان بەرێو بەرن. وە سیستەمی ئینتداب بەسەر ئەو سنورانەدا دەسەپێنرێت.

مادەی (٨٩): بە بڕیاری سەرۆکی ئەمەریکاو بە رەزامەندی تورکیاو ئەرمینیا لە ئەرزرۆمو تزابزونو وانو بتلیسەوە دیاری دەکرێت.

مادەی (٩٤): سوریاو میسۆپۆتامیا بە گوێرەی بڕگەی چواردەمی مادەی (٢٢)ی دەستوری کۆمەڵەی گەلان وەکو دەوڵەتی سەربەخۆ دەناسێنێ ئەو وڵاتانەش سنورەکانیان کوردستانی پێوە لکێنراوە.

٤٠.سەبارەت بە ناوی عێراق، نە لە پەیماننامەی سیڤەرو. وە نە لە بەیاننامەی ئەنگلو فەرەنسیدا وە هەتا بە پەیڕەوی کۆمەڵەی گەلانیشەوە ناوی عێراقی نەهێناوە تەنها نوسراوە میسیۆپۆتامیا، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە پێشتر لەو ناوچەیەدا دەوڵەتێك نەبووە بەناوی عێراقەوە بەو سنورەی کە ئێستا هەیەتی.

بەڵام لە ١٩١٨/١١/١دا حکومەتی شێخ مەحمود لە خوارووی کوردستان بەرەسمی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە راگەیاندراو شێخ مەحمودیش خۆی وەك مەلیکی کوردستان راگەیاند.

٤١.رێکەوتننامەی نێوان تورکیاو روسیا لە ١٩٢١/٣/١٦دا ئیمزا کرا، بەپێی ئەو رێکەوتنانمەیە رەت کردنەوەی پەیماننامەی سیڤەر بوو.چونکە حکومەتی سۆڤیەتی بە رەزامەندی خۆی دان بە هیچ بەڵگەنامەیەکی نێو دەوڵەتیدا نانێت کە پەیوەندی بە تورکیاوە هەیە، وە حکومەتی نیشتمانی تورکیا لە ئەنجومەنی گەورەی نیشتمانی تورك نوێنەرێتی دانی پێدا نانێت. هەردوولا رێك کەوتن لەسەر ئەوەی کە رێگە بە هیچ جۆرە گروپو رێکخراوێك نادەن دروست بێت یان بچێتە خاکی ئەویتر لە دژیەکێ لەو دولایەنە.

که بێ‌گومان مەبەست لە بزوتنەوەی شۆڕشگێرانەی گەلی کورد بووە کە لەو سەردەمەدا لە خەباتێکی خوێناوی‌دا بوون دژی کەمالیەان بۆ بەدەست هێنانی سەربەخۆیی خۆیان.

٤٢.لە بەڵگەنامەی وەزارەتی بەریتانی‌لە ڕێکەوتی ١٩١٩/١٢/٢٣دەردەکەوێت کە:

بەریتانیاو فەرەنسا گەیشتونەتە ئەو ئەنجامەی کە هیچ چاودێرییەکی بەریتانی یان فەرەنسی نەکرێ بەسەر سەرانسەری کوردستاندا تەنها چەند ناوچەیەکی کوردستانی خواروو نەبێت. هەڵوێستی ئەو کاتەی سەرۆك ولسون دەربارەی ئەم مەسەلەیە وتویەتی: دەبێت پشتگیری هیچ هەوڵێکی جودا خوازانەی کورد نەکەین ئەوانەی لە ئێران‌و ئەوانەی لە ژێر دەسەڵاتی تورکدا ئەژین، لەسەرمانە واز لە کوردەکانی دەرەوەی موسڵ بهێنین. وەهەر ولسن بوو لە کۆنگرەی پاریس دا پێشنیاری دروست کردنی دەوڵەتی عێراقی کرد.

وە پێشنیاری ئەوەشی کرد کە بەگوێرەی سیاسەتی بەریتانیا کوردستان ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە بلکێندرێ‌و ئۆتۆنۆمی لە ژێر چاودێری بەریتانیادا بدرێ بە کورد.

٤٣. بڕوانە: دکتۆر مارف عومەر گوڵ‌پەیمانی سیڤەر لە سیاسەت‌و یاسای نێو دەوڵەتاندا سیاسەتی دەولی-ژمارەی (١)ی ساڵی (٥)ی نیسانی ١٩٩٦.

٤٤.پەیماننامەی لۆزان لە ڕێکەوتی ١٩٢٣/٧/٢٤دا لە نێوان تورکیا حکومەتی ئەنقەرە لەلایەك وەلەلایەن بەریتانیاو یابان‌و یۆنان‌و ڕۆمانیاو دەوڵەتی سلاڤی‌و سرب‌و کرواتەکان لەلایەکی ترەوە ئیمزا کرا.

٤٥.بڕوانە : المسألە کالکردیە فی العراق الی ١٩٦١، تألیف ماجد عبدالرضا- منشورات مکتبە بغداد.

٤٦.بروانە: حاضرة، المستر س ج أدمۆندس عن المشکلة الکردیة، ١٩٦٦.

٤٧.بڕوانە: مشكله الموصل دراسه فى الدبلوماسيه العراقيه والانكليزيه التركيه فى الرأى العام، تأليف فاضل حسين.

٤٨. "ئەی. ف. فرنست" وەزیری سویدی لە بوخارست سەرۆکی لیژنەکە بوو، یەکەم کۆبونەوەیان لە ١٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٤دا بوو، وەدەست بەکار بونیان لە ٢٧ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥دا بوو کە لیژنەکە گەیشتە شاری موصل بۆ دەست پێکردنی لێکۆڵینەوەکان.

٤٩.ڕێکەوتنی تورکیاو بەریتانیا پاش ململانیەکی زۆر هات کە لە ماوەی ساڵانی ١٩٢٣تا ١٩٢٦ بەردەوام بوو بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە هەردووی پشتیان بە زۆر لە بەڵگەی یاسایی و جوگرافی ئابوری‌و دانیشتوانی دەبەست.

ئەگەر بێینە سەر باس کردنیان خۆی لە خۆی‌دا بابەتێکی قوڵە بۆ لێکۆڵینەوە. شوێنێکی فراوانتری دەوێت. تورکیاو بەریتانیا هەریەکەیان بۆ پێشینەدە-السوابق یاساییەکان دەگەرانەوە وە پشتیان بە یاسای نێو دەوڵەتی دەبەست بۆ تێڕوانینەکانیان تورکیا سوور بوو لەسەر ئەوەی "ویلایەتی موسڵ" بەشێکە لە زەوی‌یەکانی‌و لێ ی جیانابێتەوە وە بەریتانیاش ئەوەی دووپات دەکردەوەکە تورکیا لە مافەکانی خۆی لەو ویلایەتەدا خۆش بووە تنازلی کردووە بە پێ‌ی پەیماننامەی لۆزان.

وە بەریتانیا بەڵگەکانی خۆی پێشکەش بە دادگای دادی هەمیشەیی نێو دەوڵەتی کرد کە لە ٢٠ی‌تشرینی یەکەمی ١٩٢٥دا کە داوای ڕای ڕاوێژکاری کرد سەبارەت بە کێشەکە دوای کۆبونەوەی دادگا بۆ دانی ڕای ڕاوێژکاری ئەم ڕایەی کردە چوار بەش.

بەشی یەکەم: دادگا سەیری مێژووی ناکۆکیەکەی کرد هەرلەکاتی جەنگی جیهانی یەکەمەوە تا دەگاتی پێداویستی ئەنجومەنی کۆمەڵە بۆ ڕای ڕاوێژکاری.

بەشی دووەم: تەفسیر کردنی دادگا لە برگەی دووەم لە مادەی سێ لە پەیماننامەی لۆزان وەپەیوەندی بەسنوری دەسەلاتی ئەنجومەنی کۆمەڵەوە.

بەشی سێیەم: گفتوگۆ کردن لەسەر مادەکانی بەڵێننامەی کۆمەڵەوە مادەکانی پەیماننامەی لۆزان کە پەیوەست بەو رەوانکاری ئەنجومەنی کۆمەڵەوە.

بەشی چوارەم: دادگا دەرئەنجامەکانیو وەلامەکانی خۆی باس کرد بوو، وە بریاریدا کە بریاری ئەنجومەنی کۆمەڵە بەپێیبرگەی دووی مادەی سێ لە پەیماننامەی لۆزان دا سەبارەت بە دیاری کردنی سنور لە نێوان عێراقو تورکیادا دیاری کردنێکی کۆتاییه‌یە.

٥٠.بروانە: المسأله الکردیه فی العراق الی ١٩٦١، تألیف ماجد عبدالرزا. منشورات مکتبه بغداد.

٥١.مامۆستای گەورەو مێژوونوس (رەفیق حیلمی) یەکێك لەو پرسیارانەی کە لێیان کرد بوو کە ئایا لەو کاتەدا داوای دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی نیشتمانیان کردبوو کە سەربەخۆی خۆیان هەبێت وە لەژێر ئینتدابی بەریتانیدا بێت. بە بەڵێ وەلامی دابوونەوە.

٥٢.تورکەکان بۆ ئەوەی کێشە بۆ ئینگلیزەکان دروست بکەن لە سالانی دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە. پشتگیری هەموو بزوتنەوەی رزگاریخوازەکانی کوردیان دەکرد دژ بە ئینگلیزەکان.

هەر لەبەر ئەم مەبەستە شێخی نەمریان لە زیندانی سلێمانی دەرهێناو بەرێوەبردنی ناوچەی سلێمانیان پێبەخشی لەگەڵ حامیەکی تورکی بۆ ئەوەی بەناوی دەوڵەتی عوسمانیەوە حوکم بکات.

ئینگلیزەکانیش لە رێگەی پیاوەکانیانەوە پارمەتی دەرەکانیان توانیان پەیوەندی بە شێخ مەحمودەوە بکەنو توانیان رازی بکەن بەوەی دەبێت بەپێی

(مادەی ١٦)لە پەیماننامەی موندرسی ١٩١٨دا کار بکات. ئینگلیزەکان توانیان سود لە رقی کوردەکان وەربگرن بەرامبەر بە تورکەکان.

"حامیەی تورکی" تەسلیم به ئینگلیزەکان کرا لە کەرکوك بەرامبەر بەمەش شێخ مەحمود بە حاکمی سلێمانی دانرا، حاکمی مەلیکی گشتی لە بەغدا رەزامەندی خۆی نیشان دا، کە کوردستان جیا نەکرێتەوە لە قائمەی نەتەوە رزگار کراوەکاندا.

لەو کاتەی ئینگلیزەکان شێخیان بە حاکمی سلێمانی دامەزراند، لە هەمان کاتدا سەرۆکە عەشایرە خائنەکانیش یان بەلای خۆیاندا رادەکێشا، بە مەبەستی گورز وەشاندن لە بزوتنەوەی کوردی هەر کاتێك بیانەوێت، هەروەها بۆ کەم کردنەوەی دەسەڵاتی شێخ مەحمود بوو. پەیوەندی نێوان ئینگلیزەکانو شێخ مەحمود زۆر زوو تێك چوو.

کارگەیشتە بەیەکدادانی توند لە نێوانیاندا. ئینگلیزەکان هەموو توانا سەربازییەکانی خۆیان بەکارهێنا توانیان بزوتنەوەی کوردی سەرکوت بکەن، وشێخان بەدیلی رەوانەی هندستان کرد تا ساڵی ١٩٢٢ تا ئەو اتەی تورکەکان لە کوردستانی عێراق واتە لە باشوردا گێرەشێوێنی یان دروست دەکردکە داوای گەرانەوەی ویلایەتی موسڵ یان دەکرد.

شێخ توانی جارێکیتر خۆی بەهێز بکاتەوەو دەسەڵاتی بگەیەنێتە زۆربەی زۆری ناوچەکانی باشوورو وەزارەتێکی نیشتمانی پێك بهێنێت لە ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا بەڵام جارێکیتر شکستیان پێهێنا، وە دەستیان بەسەردا گرت، ئەمە جگە لە چەند (ضمانات)ێك لێ ی، وەرگیرا.

بەڵام سەرەرای ئەوە جارێکیتر لە ١٩٢٧دا گەرایەوە بۆ باشوورو سەرکردایەتی بزوتنەوەی کوردی سەر لە نوێ دەشتی پێکردەوە. شێخ مەحمود دوو نوسکراوی نادر بۆ باوەرپێکراوی سامی بەریتانی لە بەغدا داوای لێ کردن کە

حکومەتی عێراقی واز لە ناوچە کورد نشینەکان بهێنێت، وە پشتگیریان بکەن لە دامەزراندنی "حکومەتێکی کوردی"دا بەڵام بەداخەوە بزوتەوەی کوردی بۆ دواجار بە تەواوی شکستیان پێهێنا.

پاش هاوکاری کردنی هەردوو حکومەتی بەریتانیو حکومەتی عێراقی توانرا بزوتنەوەی کوردیو شۆڕشەکەیان لەناو بەرن جارێکیتر شێخ مەحمود نەفی کرا واتە دوور خرایەوە نەگەرایەوە بۆ وردستان تا ئایاری ساڵی ١٩٤١.

٥٣.بڕوانە: محاچره المستر س ج ادموندس، عن المشکله الکردیه، تحت العنوان: حرب الاکراد کفی العراق وخط الاحلال السلام. ئەدەوندس دەڵێت: بیستو پێنج ساڵی ژیانم لەم وڵاتەدا "مەبەستی عێراقە" بەسەر بردووە وەك حاکمی سیاسی پێنج ساڵ کارم کردووەو سێساڵو نیوی لە کوردستان بووە، بیست ساڵەکەی تری لە وەزارەتی دەرەوەو ناوەوەی حکومەتی مەرکەزی بووە لە بەغدا.

٥٤.لە (٢٠ی ئابی ١٩٣٠)دا بوو نێو نەتەوەیی دووەم کۆبونەویان دەست پێکرد لە (کۆنگرەی زیوخ)دا بۆ ئەم کۆنگرەیە هەردوو ڕێکخراوی خۆیبوونی کوردیو تا شناقی ئەرمەنیەکان یاداشت نامەیان نارد. بەبۆنەی تاوانی لەناو بردنی بەکۆمەڵی کوردو ئەرمەن لەلایەن تورکەکانەوە لە ماوەی ساڵانی (١٩٢٧-١٩٢٩)دا.

٥٥.بڕوانە: المسأله الکردیه فی العراق ال ١٩٦١، تألیف. ماجد عبدالرضا- منشورات مکتبه بغداد.

٥٦. بڕوانە الفدرالیه مالکردستانیه والتوقعات المستقبلیه، دراسه قانونیه، تألیف د.سربست توفیق کوبنهاجل-قوس للطباعة، ١٩٩٥.

٥٧.سەبارەت بە دروست نەبوونی دەوڵەتی کوردی یەکێ لە هۆ سەرەکیەکان هەر لە سەردەمی کۆنەوە پەیوەندییەکی توندی بە سروشتی خاكو شوێنی

جوگرافیو بارودۆخی ئاودێری کشتوکاڵ هەبووە، ئەمانە کاریگەری لەسەر گەشە کردنی کۆمەڵگای کوردەواری لە رووی ئابوریو سیاسی‌یەوە بەجێ‌هێشتووە، لە دۆڵی رافدین لەسەردەمی کۆیلایەتی‌دا رژێمی ئاودێری یەکێك بووە لە هۆکارەکانی دەرکەوتنی دەوڵەت چونکە تەنها دەوڵەت دەیتوانی پرۆژەی گەورەی ئاودێری بنیاد بنێت.

بەڵام لە کوردستاندا بە پێچەوانەوە لەسەردەمە کۆنەکانەوە پشتیان بە باران بەستووە بۆ بەروبومی کشتوکاڵی. ئەمە سەرەرای بوونی چەندەها سەرچاوەی ئاوی سازگار بەجۆرێك هەموو گوندێك یان کۆمەڵی بچوك دەیتوانی کستوکاڵ بکات بەبێ پشت بەستن بە دەوڵەت هۆکارێکی تریش سروشتی شاخاوی کوردستان رێگرێك بووە لەبەردەم هاتوچۆی کاروانە بازرگانیەکان لە نێوان دەوڵەتە جیاوازەکاندا.

ئەکەوتنە سەر هیچ روبارێکی گەورە یان دەربەندی دەریایی بۆ بەستنەوەی بە جیهانی دەرەوە. لەبەر ئەوە تێپەڕ بوونی کاروانەکان لە زستاندا کارێکی زەحمەت بووە وبە هۆی سەرماو بەفری زۆرەوە ئەمە جگە لە دابین نەکردنی سەلامەتیان لە هێرشی هۆزەکان لە دەربەندە شاخاوییەکاندا ئەمانە بوونە هۆی دامەزراندنی ناوەندی بازرگانی گەورە لە کوردستاندا.

سروشتی شاخاوی کوردستان بەربەستێکی پتەو بووە لەبەردەم هێرشی لەناوبەرانەی داگیرکەران کە بە کوردستاندا تێ‌پەڕیون بەبێ ئەوەی بتوانن دەسەڵاتیان بگەیەننە هەموو ناوچەکان.

دەتوانین ئەمە بە هۆکارێکی‌تر دابنێین بۆ ئەوەی کە کوردەکان پێویستیان بە دەوڵەت نەبووبێت وەیان بیریان لە دەوڵەتێکی یەکگرتوو نەکردبیتەوە کە بتوانێت بە بەرگری کردن هەڵبستێت دژی هێرشی داگیرکەران. وەدەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە دووبارە سەختی کوردستان رێگرێك بووە لەبەردەم (میرە) کوردەکاندا کە

بتوانن دەسەڵاتیان بەسەر هەموو کوردستاندا بسەپێنن، وە دەوڵەتی ناوەندی خۆیان دابمەزرێنن. هەر لەبەر ئەم هۆیانە بووە دەبینین کە دەسەڵاتی ئیمپراتۆریتەکانی تورکی، فارسی، عەرەبی. لەسەر کوردستان زیاتر رووکەش بووە. چونکە هیچیان نەیانتوانیوە دەسەڵاتێکی سەرتاسەری بەسەر هەموو ناوچە کوردیەکاندا بسەپێنن.

٥٨.دەوڵەتە زلهێزەکانو زۆربەی زۆری ئەو دەوڵەتانەی کە خوازیاری پەیوەندی باشن لەگەڵ عێراقو ئێرانو تورکیادا لایەنگرێتی رەگەز پەرستو سیاسەتی کۆلۆنیالیستی یان دەکەن.

چونکە داگیرکەرانی کوردستان (ئێران، عێراق، تورکیا، سوریا) ئامێرو شێوازی چاك دەزانن لەبەکارهێنانی پسپریانەی تواناو تاقەتی بازرگانیو ئاڵو گۆڕی دەرەکیو خستنەگەری پارەدا.

لەبەر ئەم دەوڵەتانە (زلهێزەکان) هێزی کرینو هەل بۆ رەخساوی پیشەسازیو پێش خستنی بازرگانییەوە وای لێ کردن کە پشت لە مەسەلەی کورد بکەنو پاڵ بنێن بە بوونی هەندیچ بەهای کاتیو بەها جیهانیەکانەوە وەك مافی مرۆڤو یەکسانیچتی نەتەوەکان وە سیاسەتی وڵاتە سۆشیالیستو کۆمۆنیستەکانیش هەر لە هەمان سنوردا خۆی ساخ دەکاتەوە.

٥٩.بڕوانە کوردستان کۆلۆنییەکی نێو دەوڵەتییە نوسینی .د.ئیسماعیل بێشکچی. وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی رۆنبیر، هەولێر بەرگە یەکەم ١٩٩٣.

## سەرچاوەکان..

١.المسأله الكرديه فى العراق الى ١٩٦١. ماجد عبدالرضا-منشورات مكتبه بغداد-مگبعه دار الجاحظ.

٢.الصراع على كردستان (المسأله الكرديه فى العلاقات الدوليه خلال القرن التاسع عشر). تأليف د. ن. ا. خالفين. ترجمه د.احمد عسمان بكر.

٣.أصول علم السياسة-د.محمد طه بدوي، الطبعة الثانية.

٤.الوضع القانونى الاقليم عربستان في ظل القاعد الدولية، عبدالمجيد اسماعيل حقى-مطبعة المدنى-القاهرة. ١٩٧٤.

٥.فيدراليه الكردستانيه والتوقعات المستقبليه (دراسه قانونيه)، تأليف د.سربست توفيق. قوس للطباعة-كوبنهاجن، ١٩٩٥.

٦.القضية الكردية والقومية العربية فى معركة العراق، محمود الدرة-منشورات دار الطبعة-بيروت الطبعة الاولى ١٩٦٣.

٧.الماركسية والمسألة القومية، تأليف جورج طرابيشى-منشورات دار الاداب بيروت الطبعة الاولى تشرين الثانى ١٩٦٩.

٨.لينين حول حق الامم فى تقرير مصيرها.

٩.الامم والتقدم الاجتماعى، كوليتشينك-دار التقدم موسكو.

١٠.اسس الفسفه الماركسيه، تأليف: ف أفاناسييف، ترجمه عبدالرزاق الصافى.

١١.لينين ملاحظات أنتقادية حول المسألة الوطنية حق الامم فى تقرير مصيرها، دار الطبع والنشر للعات الاجنبية-موسكو الاتحاد السوفيتى.

١٢.لينين (المسائل السياسه القوميه واللامميه البروليتاريه) ترجمه الياس شاهين-دار التقدم موسكو.
١٣.لينين "حركة شعوب الشرق التحررية الوطنية" مجموعة من العقالان والخطب=دار التقدم موسكو جمعت المجموعة وضعت المقدمة من قبل، ليترزين. ترجمة الياس الشاهين- طبع فى التحاد السوفيتي.
١٤.تقرير المپير (دراسه مقارنه فى التاريخ و القانون الاقتصاد والمجتمع الدولى) تأليف: حسين على الجيشى-دار الكاتب العربى.
١٥.تاملات فى ثورات العصر، لاوسكى هارولد (هارول لاوسكى) ترجمة، عبدالكريم احمد جامعة دول العربية الادارة التقافية دار العلم-القاهرة.
١٦.مبدأ تقرير المصير والعرب- تأليف زهير عطية، شركة الرابطة للطبع والنشر-بغداد ١٩٥٩.
١٧.مساله الامه وحق تقرير المصير، تأليف بيلنا جينسكايا، ترجمه رفعت السعيد.
١٨.مشكلة الموصل "دراسة في الدبلوماسية العراقية الانطليزية التركية فى الرأى العام" تأليف د.فاضل حسين-الطبعة الثانية-مزيدةو منقصة ١٩٧٧، رقم الابداع فى المكتبة الوطنية بغداد ٣٧٧ لسنة ١٩٧٥.
١٩.محاضرة "المستر س.ج. أدموندس عن المشكلة الكردية" ألفيت في الجمعية الملكية الاسيا الوسطى فى ١٩٦٦/١٠/٢٥، ترجمة كردى مخلص.
٢٠.سلامه موسى-كتاب اليورات-دار العلايين، بيروت.
٢١.الكرد والمسالة الكرديه، تأليف د.شاكر خصباك-بغداد ١٩٥٩.
٢٢.كوردستان، كۆلۆنییەكی نێو دەوڵەتی‌یە، نوسینی د.ئیسماعیل بێشكچی.وەزارەتی رۆشنبیری، چاپخانەی رۆشنبیری، هەولێر بەرگی یەكەم ١٩٩٣.

٢٣.گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی (سیاسەتی دەولی):

أ.ژمارەی (١)ی ساڵی ٥ی نیسانی ١٩٩٦. د.مارف عومەر گو ڵ، پەیمانی سیڤەر لە سیاسەتو یاسای نێو دەوڵەتاندا.

ب.ژمارەی (٣)ی ساڵی ٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٤.

ج-ژمارەی ٤ی ساڵی ٣ی کانوونی دووەمی ١٩٩٥. نوسینی د.مارف عومەر گوڵ، بابەتی بەجیهان کردنی مەسەلەی کورد لەبەر رۆشنایی یاسای تازەی نێو دەوڵەتاندا.

٢٤.سەنتەری برایەتی، گۆڤارێکی وەرزیی فیکری سیاسیە رۆژنامەی برایەتی دەری دەکات، مارە (٤)ی شوباتی ١٩٩٨.

٢٥،الحقوق الدولية العامة، تأليف سباط فوؤار-طبع الجامعة السورية، دمشق ١٩٥٦.

٢٦.القانون الدولى الخاص، تأليف عزالدين عبدالله- الهيئه المصريه العامه التاب، ١٩٨٦.

٢٧.القوميه فى التأريخ والسياسه، تأليف فردريك هرنز-دار الكاتب العربى القاهره.